| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەجادی. |
| مشخصات نشر | : | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | : | ۸ ج.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ سم. |
| شابک | | دوره : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۱-۸ / ج۱ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰٤۱۲-٥<br>ج۲ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۳-۲ / ج۳ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٤-۹<br>ج٤ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٥-٦ / ج٥ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٦-۳<br>ج٦ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۷-۰ / ج۷ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۸-۷<br>ج۸ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۹-٤ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م. |
| موضوع | : | ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq |
| موضوع | : | داستان‌های طنزآمیز کردی |
| موضوع | : | Humorous stories, Kurdish* |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۸۲۶۲ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۴۲۸۵۳۱ |
| وضعیت رکورد | : | فیپا |

# ڕشتەی مرواری

-٧-

کۆمەڵە ئەدەبیێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی


دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**





انتشارات کردستان

سنه



# ڕشتەی مرواری

## - ٧ -


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠ـ ٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ١٨٠ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ٨ ـ ٤١١ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ ـ شابک جلد (٧): ٧ ـ ٤١٨ ـ ٩٨٠ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزق، انتشارات کُردستان، تلفن: ٠٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

سنە، پاساژی عیززەت، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٨٧ ٠٠٩٨

# ناواخن

# پێشەکی

دوو جۆرە ئەدەب هەیە: ئەدەبی تایبەت، ئەدەبی گشتی. تایبەتییەکە هی نەتەوەیەکی تایبەتییە و لە جەرگەی ناوچەی ئەو نەتەوەیەوە دروست ئەبێ، گشتییەکەش ئەدەبێکە کە هەموو نەتەوەیەك تیایا هاوبەشن. ئەم جۆرە ئەدەبەیان بریتییە لە نوکات و قسەی بەتام و ئەو شتانە کە زاخاوی مێشك ئەدەنەوە. هەر نەتەوەیەك زمان و قەڵەمی بڵاوکردنەوەی هەبووبێت، لەو قسانە، وەیا لەو مەفهوومانەی خستۆتە ناو چوارچێوەی زمانەکەی خۆی و بڵاوی کردۆتەوە. ئەو نەتەوەیەش کە ئەو زمان و قەڵەمەی نەبووبێ هەروا ماوەتەوە و نەیتوانیوە هیچ چەشنە بزووتنەوەیەك بۆ خۆی دروست بکا، تەنیا ئەوەی بۆ ماوەتەوە کە بۆی خوێنراوەتەوە: لە فلان کتێبی فلان زماندا وا نووسراوە و وا وتراوە.

کورد، یەکێك بووە لەو جۆرە نەتەوە بێ‌زمانانە؛ خۆی هیچی بۆ کۆ نەکراوەتەوە ـ بۆ چاپ کردنی بە زمانەکەی خۆی ـ لە زمانی‌ترەوە شتی بۆ خوێنراوەتەوە و ئەو شتەی بە هی ئەوان زانیوە، با ئەساڵەتی ئەو شتەش هی ئەو بووبێ، بەڵام لەبەر ئەوە کە خراوەتە سەر زمانێکی‌تر و لەوەوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەم، هەر بە ماڵی ئەو زمانەی زانیوە.

من لەسەر ئەو باوەڕەم، وە لام وایە ڕایەکەشم لەگەڵ واقیعدایە کە کورد هەتا ئەم چەرخی دواییە زمانەکەی نەخراوەتە سەر لاپەڕەی چاپ؛ ئەو

چاپەی کە لەناو ئەودا بڵاو بووەتەوە یا عەرەبی بووە بە حوکمی دین، یا فارسی بووە و هەندێ‌جاریش تورکی بووە بە حوکمی حوکم، کورد ئەگەر ویستبێتی شتێك بۆ خۆی بنووسێ هەر بە یەکێ لەو زمانانە بووە. ئەدەبی کورد تەنیا ئاشنایەتیی بە ئەدەبی ئەو زمانانەوە بووە، چونکە تێکەڵاوییەکەی هەر لەگەڵ ئەوانا بووە، ئەدەبی ئەورووپی بە هەموو جۆر بێگانە بووە لە ئەدەب و زمانی ئەم، چونکە ئەم ئەدەبی ئۆرووپییە لەم سەدەی بیستەما تۆزێ لە ناویا بڵاو بۆتەوە، ئەو هێزەی نەبووە ـ لەلایەن بڵاوبوونەوەوە ـ کە کار بکاتە سەر ئەدەبەکەی ئەم، بە تایبەتی ئەدەبی فۆلکلۆری.

ئەو زمانانەی کە وتم، لەبەر ئەوە خاوەنی هێز بوون، لە وڵاتانی پان و درێژی ژێردەستیانا هەر شتێکیان دیبێت و بیستبێت بەو زمانەی خۆیان گوزارشتیان لێی داوەتەوە و شتەکە بەو زمانە بڵاو بۆتەوە. یەکێ لەو شوێنانە کە شت و زمانەکەی ئەوانی تێدا بڵاو بۆتەوە وڵاتی کوردەواری بووە: گەلێ شت، گەلێ ئەدەب، گەلێ فۆلکلۆری ئەوان خراونەتە سەر ئەو زمانە و گەڕاونەتەوە بۆ ئەمان، ئەمانیش وایان زانیوە کە هی ئەوانە، کەچی لە ڕاستیدا وەکوو ئایەت ئەفەرموێ: ﴿بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَاۖ﴾ وەیا سەرگوزەشتێکی کوردی ئەڵێ:

جارێك کابرایەکی کورد لە هاوینا ڕێی ئەکەوێتە شاری بەغدا، کابرای ئاوفرۆشی بەغدایی بانگ ئەکا: «مای بارد»، ئەمیش بەلایەوە شتێکی سەیر ئەبێ، ئەڵێ: برا بکێشە بایی قڕانێك لەو مای باردە، نەیژی کوردە پووڵی نەدیگە! زۆر بە تاسەوە ئەیخواتەوە سەیر ئەکا ئەمە هەر ئاوە و هیچی‌تر! کە ئەگەڕێتەوە بۆ وڵات لەناو عەشرەتا دائەنیشێ و ئەڵێ: «کورە ئەگەر چوونە بەغدا بانگیان کرد: مای بارد! نەکەن بیخۆنەوە، ئەوە هەر ئاوە پەتییەکەی لای خۆمانە، با پوولەکەشتان لێ‌نەسێنن».

زۆرێکی زۆر لە نوکات و قسە و سەرگوزەشتێ کە لە ناوچەی کوردەوارییەوە دروست بووە لەبەر بڵاوبوونەوەی ئەو زمانانە لە ناوچەکەدا ئەو سەرگوزەشت و قسانە خراونەتە سەر ئەو زمانانە و کوردەکە خوێندوویەتەوە وتوویە: لە فڵانە کتێبی عەرەبی وەیا فارسی و تورکیدا وا ئەڵێ! شتەکەی داوەتە پاڵ ئەوان، ئیتر ئەوەی لەبیر چووەتەوە کە ئەمە هی خۆیەتی و ئەوان خستوویانەتە ناو زمانی خۆیانەوە، لەمیان زەوت کردووە!.

من گەلێ لەو کتێبانەم خوێندووەتەوە، وەیا زۆر جار بیستوومە کە یەکێك شتێکی گێڕاوەتەوە وتوویە: ئەمە لە فڵانە کتێبی فارسی وەیا عەربیدا نووسراوە، کەچی لە ڕاستیدا شتەکە بە مەفهوومێکی ڕاستەقینە و بە جۆرێکی ئەسیل لەناو کوردەکە خۆیدا هەیە و هەبووە؛ بەڵام لەبەر ئەوە کە زمانی بڵاوکردنەوەی نەبووە نەکەوتۆتە ژێر ئەو بڵاوبوونەوەیە بە زمانەکەی خۆی، زمانیتریش دەستکارییان کردووە و خستوویانەتە ناو زمانی خۆیانەوە و داویانەتە پاڵ خۆیان؛ ئەمە شتێکیتر، نەتەوە ئەبێ هەموو شتێکی هەبێ، کوردیش ئەگەر دانی پیا بنێن کە نەتەوەیە، نابێ ئەمیش ئەوانەی نەبێ، خۆ ئەگەر وتراش نەتەوە نییە، ئەوا ئیتر من هیچ قسەیەکم نامێنێ.

من لە ساڵی(١٩٥٧)ەوە لە بڵاوکردنەوە و چاپکردنی ڕشتەی مرواریدام. لەو ماوەیەدا تا ئێستە، ئەمە بەرگی حەوتەمیەتی. ئەو شتانە کە لەناو کورددا هەبوون و بڵاو بوونەتەوە، من کۆم کردوونەتەوە و خستوومنەتە نێوانی دوو بەرگی بەرگەکانی ڕشتەی مرواریەوە. وە ئەو شتانەش کە من وتوومن، هی خۆم نین و من نەموتوون؛ بەڵکوو کوردەکە خۆی وتوونی و هەر کورد بۆی ناردووم، کەچی وەختی واش بووە بیستوومە وتوویانە: ئەو فڵانە شتە کە لە ڕشتەی مرواریدا هەیە لە فڵانە کتێبی

عەرەبی وەیا فارسیدا هەیە؛ من ئینکاری ئەمە ناکەم؛ ڕەنگبێ هەبێ، بەڵام وەکوو وتم: ئەدەبی گشتی، هەموو نەتەوەیەکی دراوسێی تێدا شەریکن، پێشدەستی ئەوان ئەوەبوو کە زمانی بڵاوکردنەوەیان هەبووە، لە ئێمەیان وەرگرتووە و بەناو خۆیانەوە بڵاویان کردۆتەوە. من ئەمە ئێستە قەبووڵ ناکەم، شتی خۆمە و بە زمانی خۆم بڵاوی ئەکەمەوە، لەمە زیاتر باج دان خوا هەڵناگرێ.

هەندێ ناو لە ڕشتەی مرواریدا دێت، ڕەخنەگر لە ئەدەب ئەو ناوانە ئەکا بە گوڵدەستەی دەستی بۆ ڕەخنە گرتن. دیسان من ئەمەش هەر قەبووڵ ناکەم؛ چونکە من چۆنم بیستووە و چۆن بۆیان گێڕاومەتەوە، وەیا بۆیان ناردووم و بەناوی کێوە ناردوویانە، بەو تەرحە بڵاوی ئەکەمەوە؛ دەست لە ئەمانەت نادەم. لەگەڵ ئەوەشا من بەلامەوە وایە ئەو ناوانە کە ئەو جۆرە قسە، وەیا کردەوەیان نواندووە، بەلای من و بەلای هەموو ئەدەبپەروەرێکەوە بلیمەتیی ئەوانە دەرئەخا؛ نەوەك پایە کەم کردنەوەیان.

بۆ وێنە: یەکێکی وەکوو شێخ ڕەزای تاڵەبانی هۆنەرێك بووە وەکوو هۆنەرەکانی‌تر؛ کەچی لەو ڕێچەکەیەی ئەودا و لەو ئیلهامەی ئەودا نە هیچ هۆنەرێکی‌تر ئەیگاتێ، وە نە من و تۆیش ئەتوانین ئەو فیکرانەی ئەو دەری‌بڕیون، دەریان‌ببڕین. ئەمە لێرەدا بلیمەتی شێخ ڕەزا دەرکەوت، نەوەك پایە نزمی. ناوەکانی ڕشتەی مرواریش چەشنی سەمەرەیان هەیە. مەجۆلی خامە و مەلا سمایلی کانیسکان و عەزیز بەگ و سەدها ناوی‌تر بەلای منەوە بلیمەت بوون؛ ئەگینا بۆچ من نازانم وەکوو ئەوان بڵێم؟ نەتەوەکانی‌تر لە هەموو شتێکی خۆیانەوە بۆ قسە لێوەکردن درێخیان نەکردووە، منیش نایکەم. ئەگەر ئێستە نرخی ئەوانە نەزانرێ، مێژووی سبەی و دوو سبەی نرخیان ئەزانێ.

دوور نییە هەندێ شت لە ڕشتەی مرواریدا هەبێ، بە چاو هەندێکەوە بڵێن ئەوە چییە وا چاپ ئەکرێ؟ من بەلامەوە لە ڕووی ئەدەبێکی پان و فراوانەوە چاپکردنی ئەوانە پێویستترە؛ چونکە ئەوانە ئازووخەیەکی هەمەڕەنگن بۆ دوارۆژ.

خاڵۆ بچۆ کتێبی بێگانەکان بخوێنەوە بزانە چەیان کردووە و چییان نووسیوە؟ هەر ئەو نووسینەی ئەوان بووە بۆ ئەو شتانە، کە مێژوویەکی گەورەی بۆ دروست کردوون.

**عەلائەددین سەجادی**

**١٩٧٩/ ١٠/١**



# شەکروای دەماخ

١. بارام‌بەگی ئەحمەدبەگی ڕیشێن و شێخ عەلی شێخ کەریم ئەچنە بەغدا و ئەچنە «لۆقەنتە». کابرای «بۆی» دێت ئەڵێ: چی ئەخۆن؟ بارام‌بەگ ئەڵێ: من برنج و شێخ مەحشی. ڕوو ئەکاتە شێخ عەلی ئەڵێ: «أنتَ هَمْ شَيْخ مَحْشي؟» ئەڵێ: «نا نا آني شَيْخ عَلي».

٢. مارفی سەمێنی شاتری هەبوو لەو شارەزووره ڕەشماڵی هەڵدابوو. سەی حەبیبێکی کاشتەریش هەبوو ئەبێ بە میوانی ئەم مارفە. مارف لێی ئەپرسێ: ئەرێ برا، خاڵە سەیی پێغەمبەر ڕۆحم وە قوروانی وێ، لە دەوارا دائەنیشت یا لە خانگا؟ ئەویش ئەڵێ: دیارە لە خانگا بوو. ئەڵێ: «دەسا هەڵسە برۆ دەویت باوك نانێکت نادەمێ؛ وەو سەی ساقە من تا ئێستە وام زانیگە لە دەوارا بووگە!».

٣. «صدیق القادری» بۆی گێڕامەوە وتی: پێش ئەوە بچم بۆ عرووسیات و ببم بە پاشا، لەو پشدەرە کاروبارێکی میری ئەو سەردەمەم بەدەست بوو. کابرایەك ئەسپێك و تفەنگێك و سەد لیرە و دوو ژنی هەبوو؛ یەکێ پیر و یەکێ جوان. پیرەکەیان هاتە لام شکاتی لە مێردەکەی کرد کە باش لەگەڵیا ناجووڵێتەوە؛ منیش ناردم مێردەکەیان هێنا و پێم وت: بۆچ لەگەڵ ئەم ژنەتا ڕێ ناکەوی؟ کابرا هەر دانی پیا نەئەنا و منیش هەر درێژەم ئەدایە. لە ئەنجاما کابرا وەڕس بوو وتی:

«پیاوەفەندی هەر شتێکم هەیە ئەتدەمێ تۆ شەوێك بچۆرە لای ئەم ژنەم جا بزانە ئەو وەختە نالێیت گووم خوارد؟!».

٤. کابرایەکی خۆشناو ئەچێ بۆ حەج و ئەگەڕێتەوە، لێی ئەپرسن: حەج و ماڵی خوا کوو بوو؟ ئەڵێ: «خودا لە ماریێ نەبوو، پێغەمبەریش حەمری دابوو بۆ تۆ، منیش لۆ خۆم هەر وا گەڕامەوە چ دەستێم ماچ مەکەن!».

٥. لە کۆیەوە مەولوود حسێن ناردی بۆ ڕشتەی مرواری گێڕایەوە وتی: لەو وڵاتە پیاوێك سێ کچی قەیرەی هەبوو، بەڵام لە ئەقڵا ساوا بوون. سەرباری ئەمەش لە قسە کردنیشا وەکوو «تور» وا بوون؛ بەتایبەتی نەیانئەزانی «کاف» بڵێن، ئەیانکرد بە «ت».

ڕۆژێك لە گوندێکی ترەوە داخوازیکەران چوون بۆ خوازبێنی یەکێکیان. دایکەکەیان دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنیان وتی: کە ئەو ماڵە هاتن بۆ خۆتان بە ئاقڵانە دانیشن و هیچ دەنگ مەکەن؛ بەڵکوو ئەمە خوایە دەروویەکتان لێ بکاتەوە. ئەوانیش وتیان: باشە.

ماڵی داخوازیکەر هاتن و هەموو خێزان پێکەوە دانیشتن و کچەکانیش بە ڕیز لە تەنیشت یەکەوە دانیشتن. کوتوپڕ لەو کاتەدا مشکێك دەرکەوت. کچە گەورەکە وتی: ئای ئەوە مشتەتەیە! ناونجییەکە وتی: «ئای وەڵڵا چووە تونەتەوە». بووچکەلەکە وتی: «دەسا وەڵڵا هەر خۆم چاتم ترد دەنگم نەترد و مێردی خۆمم ترد!».

٦. مەلا سالحێکی «میانە»یی هەبوو گێڕایەوە وتی: ساڵێك زوو بۆ مەلایەتی ڕەمەزان چووم بۆ ناو جاف، لەو گەرمیانە بووم بە مەلای خێڵێکی تەرخانی و لە ماڵی کوێخا سمایلی عەزەی شەریفدا

بووم. بە شەو خەڵکەکە لەوێ کۆ ئەبوونەوە، منیش حەدیسم بۆ ئەخوێندنەوە. شەوێك دانیشتبووین، پیاوێك لە خێڵەکەدا هەبوو مارفی سەمینیان پێ ئەوت، لە پاش حەدیسەکە ئەم قسەیەی گێڕایەوە وتی:

ئەوا نەخۆشم، لە ژێر دەوارەکەی خۆمانا کەوتگم" خزم و عەشرەت گشتیان لێم کۆ بووگنەسەوە؛ منیش لە حاڵی خۆمام. فرەی پێ نەچوو تەوەزەلێکم بەرچاو کەوت. فرە ترسیام وتم: بوێ و نەوێ ئەمە ئزراییلە. جورائیل دەستی گرتگە هاوردگیە بۆ لای من!. بەخوا هەر کە وامزانی نەمکردە نامەردی تەکانم دا وە خۆم هەڵسیاوم، وە بێدەنگێ خۆمم باریك کردەوە، وە تەنیشتی مەجە و پیزەی میمکەزاگما وە دزییەوە لە گۆشەیەکی دەوارەکەوە هاتمە دەرەوە. ئەوەندەم زانی بوو وە قیژ و واژ لە ژێر دەوارەکەوە؛ تومەس ئەمە ئزراییل کە منی دەست نەکەوت، خۆی پلکاند وە ڕەمەزانی حەسەنی یاوەریەسەوە. ڕەمەزانیش هەر فرە قەوی و قۆڵ وو خۆی ڕمان وە ملیا هەرچەندە جرەی کرد و فرەی کرد و دەمی نوقاند ئاخری گیانی لە قنگیەوە دەرهاورد. منیش لەولاوە دەرچووم و وەکوو پیاو تری ئزراییلم وڕی.

ئیتر خێڵ کەوتنە شین و شەپۆڕ وە خەیاڵی خۆیان بۆ من ئەگریان، منیش کردم وە دەوارا وتم: عەشرەت ئەوا من ماگم و تری ئزراییلم وڕیگە، نازانم ڕەمەزانە بێفەرە ـ گووی تۆی لێ نەوارێ!ـ بۆچی خۆی دا وەدەسەوە؟ خۆ هەر باهوێکی، چواری وەکوو منی ئەوڕیەوە!.

٧. کابرایەکی «بانی خێڵان»ـی چووبوو بۆ حەج و لەولاوە چوو بۆ مەدینە بۆ زیارەتی پێغەمبەرﷺ. حاجی مستەفا پاشا

ئەیوت: کابرا ڕووی کردبووە مەرقەدەکە و ئەیوت: «هەی خاڵەحەمەی شێخ ئەولا! بێم وە دەورتا! ئەزانی لەو وەختەوە کە کۆچی خێرت کردگە چ عەزیەتێکی ئەو حەشاماتە ئەدەی؟ ئاخر ئەمە شوێنە تۆ تیا مردگی؟ با لە جێگایەکی وەکوو «باڵاتەران» چاوت بنیای وە یەکا و جێگایەکی وات بدۆزیایەتەوە و سەرت تیایا بنیایەتەوە!».

٨. محەمەدی مەلا کەریم گێڕایەوە وتی: جارێك شێخ سەعیدی مەسۆیی ئەچێتە پێنجوێن و ئەچێتە چاخانەیەك. ڕادیۆ تازە کەوتبووە پێنجوێنەوە، لەو کاتەدا ڕادیۆ قورئان ئەخوێنێ و کە تەواوی ئەکا ئەڵێ: «صدق الله العظیم». خەڵکەکە هەموو هەڵئەستنە سەر پێ. هەستانی ئەوان و چوونە ژوورەوەی شێخ سەعید یەك ئەگرێ؛ ئەم وا تێ‌ئەگا کە ئەوانە لەبەر ئەم هەستاون. بە هەردوو دەست ئیشارە ئەکا و بە زمانیش ئەڵێ: «ڕەحمەتتان لێ بێ هەرکەس لە شوێنی خۆی دانیشێتەوە، زەحمەت مەکێشن!».

٩. کابرایەك لە دێی «ئاوکورت»ـێ هەبوو حەمەی عەولای ناو بوو. تۆزێ دەوڵەمەند بوو، ئەو ساڵە سەپانێکی ڕاگرتبوو. خەڵکی ئەو دەوروبەری «گرێزە» و «موان»ـە بوو، بەڵام هەتا بڵێیت کابرایەکی کەلەڕەق و تەمەڵ بوو.

شەوێك لەگەڵ حەمەی عەولای ئاغایا پێکەوە دانیشتبوون. حەمە زۆری تینوو بوو پێ وت: ئا کوڕم بچۆ تۆزێ ئاوم بۆ بێنە. کابراش وتی: «لالەحەمە من ئەبێ جارێ بچم بۆ سەر گۆزەکە و جارێك بێمەوە. جارێك کوچەڵەکە بەرمەوە و دیسان بێمەوە؛ ئەمە چوار جار. نەوەڵڵا خۆت هەستە سووك و باریك خێرا بچۆ ئاو بخۆرەوە و وەرەوە». لە پاش

ماوەیەك دیسان حەمە پێی ئەڵێ: ئا کوڕم سەرێك بکێشە دەرەوە بزانە ئەبارێ؟ ئەویش ئەڵێ: «لالە، من بۆ بچم؟ ئێستە پشیلەکە دێتە ژوورەوە؛ ئەگەر تەڕ بوو ئەوە دیارە ئەبارێ».

١٠. میرزا ئەحمەدی فەتاحی حاجی حامد هەبوو لە سولەیمانی. مەلا ڕەئووفی سەعاتچی بۆی گێڕامەوە وتی: ناوی خۆی نابوو «پاشاوات زادە». ئەیوت: من یەکەم شاعیری وڵاتی بابان و ئەردەڵانم. مستەفا مەلا غەفووریش هەبوو لە هەڵەبجە. ئەم میرزا ئەحمەدە شیعری بە مستەفادا ئەوت؛ ئەمە یەکێکە لە شیعرەکانی:

**تەپاڵە لەگەڵ چینی بەسەر ڕفەدانان مچە کوردەیە**
**تەیناڵ بە باری قۆڕیا بۆ ئێمە بەجێمان ئەمانەیە**

(تەیناڵ شوێنێکە لە بەینی چەمچەماڵ و سولەیمانیدا. لایەکی بازیانە، لایەکی سوورداشە، لایەکیشی قەرەداغە. مەبەستی بە تەیناڵ بە باری قۆڕیا، قەرەداغ بوو).

١١. فەرامیرزا حاکمی «سنە» ئەبێ. پیاوێك هەبوو ناوی «ئەولێ» بوو، ئەچێتە لای و پێی ئەڵێ: «لە خانەدانی خانەدانگەل، لە شانشینی شازادەگەل، چل چرای چل چراگەل، هاوزاوای موشیرگەل، تۆسکەی ئەمیرگەل، سەردانیشتگی جێگەگەل، فەرامیرزای فەرامیرزاگەل؛ زەمانگەل پشتی تێ کردگین، نە ماڵگەل ما نە منالگەل؛ لە دوای ئەوە کە نۆ خاوەن تەلاق لە باخچەمانا بوو ئیسە فرمانم کەفتگە بە کەرێکی خوەیشکی نێرەکەر. پام نیاگە بە جەرگی خۆما وام چاو پێ‌کەفتگە لە خەوما داروی دەردم لای ئێوەگەلە؛ دەرمانی ئەکەن بەو کەرەشەلە!».

فەرامیرزا کە گوێی لەمە ئەبێ بەلایەوە سەیر ئەبێ، دەستی ناچێتە

کیسەی خۆی میراخوڕەکەی خۆی بانگ ئەکا پێی ئەڵێ: بچۆ لە بازاڕا بزانە هەرکەسە «کەچەڵ»ـە هەواسییەکی لێ بسێنە. هەرکەسە «جەمشیر»ی ناوە هەواسییەکی لێ بسێنە، هەرکەسە «زوڕناژەنە» هەواسییەکی لێ بسێنە، هەموو بدە بەم پیاوە با بیدا بە کەرێك بۆ خۆی[1].

میراخوڕ ئەچێتە بازاڕ زۆر ئەگەڕێ کەسی وای دەست ناکەوێ، لە ئاخرا کابرایەکی بەرچاو ئەکەوێ بە سەروپێچەکەیا بۆی دەرئەکەوێ کە ئەمە کەچەڵە. یەخەی کابرا ئەگرێ و ئەڵێ: بێنە هەواسییەك!. کابرا سەری سڕ ئەمێنێ ئەڵێ: هەواسی چی؟ ئەڵێ: بە ئەمری فەرامیرزا هەرکەس کەچەڵ بێ ئەبێ هەواسییەك بدا. ئەڵێ: من کەچەڵ نیم و خۆی ڕائەپسکێنێ. میراخوڕ پەلاماری ئەدا و دەستی لە سەری ئەکەوێ. سەروپێچەکەی دێ بە دەستیەوە، سەرێکی سووری وەکوو چەوەندەر دەرئەکەوێ، ئەمجا کابرا بە تەواوی تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: کورە من جەمشیرم، جەمشیر. ئەگەر نەتزانیوە، بیزانە. تۆ چۆن ئەتوانی هەواسی لە من بستێنی؟ میراخوڕ ئەڵێ: ئای جەمشیریشی؟ کەواتە بێنە دوو هەواسی. کابرا ئیمان لە سەریا نامێنێ ئەڵێ: کورە چاو بکەنەوە من زوڕناژەنم، هەر ئێستە بەم زوڕنایە حەیا و ئابڕووتان ئەبەم لەم شارە، وە دەست ئەبا زوڕنایەك لە ژێر کەوا و بەر پشتێنەکەیا ئەبێ دەری‌دێنێ، ئەیەوێ بیبا بۆ دەمی و فووی تیا بکا میراخوڕ ئەیگرێ و پێی ئەڵێ: ئای زوڕناژەنیشی؟ کەواتە بێنە سێ هەواسی!.

بەم جۆرە میراخوڕ سێ هەواسی پەیدا کرد و بردیەوە بۆ فەرامیرزا. ئیتر نازانم دای بە ئەولێ یان نە؛ ئەوە لە عیلمی خوادایە.

---

١. «هەواسی»: چوار «شایی» ئێرانی بووە. ئەسڵەکەی «عەباسی»ـیە، پارەی سەردەمی شاعەباسی گەورە بووە، «پارە»کە خۆی نەمابوو، ناوەکەی مابوو، کە دوو «سەننار»ی [صَنّار = سەد دینار]، وەیا چوار شایی بووە. بیست شایی «قران»ێك بوو.

١٢. شێخ مستەفای شێخ نەجیبی قەرەداغی و شێخ عەلی قەرەداغی هەبوون هەردووکیان خزمی یەك بوون. شێخ عەلی لە سولەیمانی، قازی و شێخ مستەفا لە قەرەداغ بوون؛ هەردووکیان ڕێگای نەکردنیان گرتبوو: شێخ مستەفا ئەوی خوا حەزی پێ نەکردایە نەیئەکرد، شێخ عەلی ئەوی خوا حەزی پێ بکردایە ئەو ئەوەی نەئەکرد.

شێخ عەلی نەخۆش ئەکەوێ. شێخ مستەفا لە قەرەداغەوە دێت بۆ چاوپێکەوتن و دیدەنی. لەلای ئەبێ تا پاش عەسر، لەوانە ئەبێ نوێژەکەی عەسر بڕوا، هەڵئەستێ جوبەکەی ڕائەخا و نوێژەکەی بکا، شێخ عەلی لێی ئەپرسێ: ئەوەچی ئەکەی؟ ئەڵێ: نوێژ ئەکەم. ئەڵێ: نوێژی چی یاشێخ، تکات لێ ئەکەم ئەم «بِدعَت»ـە لە ماڵەکەی منا دامەمەزرێنە!.

١٣. عەلی کڵاشی هەبوو لەو شارەزوورە، کوڕێکی هەبوو عەوڵای ناو بوو، چووبووە درەوە بۆ خوێندنی فەقێتی. جا عەلی کڵاشی باوکی هەموو پاش نوێژانێك دوعای بۆ ئەکرد ئەیوت: «خوایە ئاگات لە عەولی کوڕم وێت، ئەگەر نایناسی کوڵەباڵێکی لەبەرایە، تاکێ لە کڵاشەکانی بەنەکەی پسیاگە، ئاغابانویەکی بۆرکاری بەستگە وە سەریەوە. لە سولەیمانی لە مزگەوتی شێخ سەلام ئەخوێنێ. حوجرەکەیان وا وەلای ڕاستی مزگەوتەکەوە، نانی فەقێکان گشت وە دەست ئەوە، تا ئەو نەیەژێ کەسیان ڕایەیان ناکەوێ نان بخۆن!».

١٤. «سید سعدالدین» هەبوو وتی: چووم بۆ ناو جاف بۆ مەلایەتی. چوومە خێڵێکی وەردەشاترییەوە و چوومە ماڵی کوێخا سەفەر. کوێخا لێی پرسیم: برا چی ئەخوێنی؟ وتم: «عَوامِل». وتی: برا «عوامل» یانێ چی؟ وتم: یانێ گاجووت. لە پاش بەینێ دەستێکی بە ڕیشیا هێنا

و وتی: خاسەشوکر خاسەشوکر. خەڵکەکە وتیان: برا ئەوە یانێ چی؟ وتی: «براگەل ئەم مەلایە فرە خاسە یەکێ ئەگەر هۆقەیە نانی خواردوێ نەختێ ئەقڵی بوێ ئەمە مانای وایە ئەم مەلایە کاری خوێندگە، گیسکی خوێندگە، بزنی خوێندگە، میێ خوێندگە، کەری خوێندگە، گەیشتگەسە گاجووت هەر تەنیا ماین و وشتری ماگە!».

١٥. «میمکە پانێ باشکی» ئافرەتێکی زۆر بە سەروبەر و خاوەنی مەڕوماڵاتێکی زۆر بوو. شێخ نووری پێنج ئەنگوست، بە خۆی و دەروێشەکانیەوە لەو دەشتی بناری کفرییە ئەبن بە میوانی. ئەویش گاڵ ئەدا بامیە و تەماتەیەکی زۆر دێنن و ئەیخەنە سەر ئاگر. لەگەڵ میوانەکانیشا هەر چیغێکیان بەینە؛ خۆت ئەزانی بامیەی گەرمیانیش زل و ناکلۆکارە. میمکە خۆی سەرکاری بامیەکە ئەکا. مناڵە وردەڵەی کوڕەزا و کچەزاکانی دەورەی لێ ئەدەن و هەر داوای لێ ئەکەن بۆیان تێکا. ئەویش بە چەپۆك ئەماڵێ بە سەریانا و ئەڵێ: «قخە»یە. مناڵان هەر وازی لێ نایەنن ئەویش تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «ڕۆڵە بچن وەو لاوە بامیە بیکەی وە قنگی نێرەکەریشا ئەی هەسوێ، هێشتا پێ نەگەیشتگە و نەکوڵیاگە. خۆ ئێوە لە شێخی تاینگ خراوترتان وە سەر هاتگە، دە لاچن بڕۆن».

١٦. شێخ ڕەزا جارێك لە ماڵی مەحمووپاشای جاف ئەبێ لە کانی چەقەڵ، ئەچێ بۆ سەر سیروان بۆ مەلە کردن. ژن و بووك و کچی پیاوێکی «پشتماڵە» لەسەر ڕووبارەکە جلیان ئەشت، بەڵام ئەمانەش قۆشمە بوون. شێخ ڕەزاش خۆت ئەیزانی چاوی کز بوو. ژنەکە دەست ئەخاتە سەر بلامانێکەی خۆی ئەڵێ: شێخ ڕەزا ئەوە چییە؟ شێخ ڕەزاش ئەڵێ: ئەوە کانی‌پانە!. پاشان کچەکە ڕووی تێ ئەکا و دەست

ئەخاتە سەر هینەکەی ئەڵێ: توخوا یا شێخ ئەی ئەمە چییە؟ شێخ ئەڵێ: ئەوە مێرگەجوانە!. ئەمجا ئەمیش دەست ئەخاتە سەر حەیتەکەی خۆی و ئەڵێ: دەی کچینە ئەمە چییە؟ ئەڵێن: نازانین. ئەڵێ: «بۆچی نازانن؟ ئەمە جوانووی جوانە لە مێرگەجوان لەوەڕانم لە کانی پان ئاوم دا لە تەوێڵەخانە بەستمەوە».

١٧. عێل سەرەوژوور بووبووەوە بۆ کوێستان. لە دوو هۆبە دوو کابرا هەبوون؛ یەکێکیان «ئەلیوەیس» و یەکێکیان «مراوەیس»ی ناو بوو. ئەویان کوڕێك و ئەمیان کچێکی هەبوو. ئەلیوەیس بەتەما بوو کچەکەی مراوەیس بێنێ بۆ کوڕەکەی.

پێکەوە ئەم دووە ئەچن بۆ بانە و ئەگەڕێنەوە، ئەگەنەوە سەر دووڕێیانەکە و لەوێوە هەرکە لا ئەدا و ئەچێتەوە بۆ هۆبەکەی خۆی. کە لێك دوور ئەکەونەوە ئەلیوەیس کەوتەوە بیری کە خوازبێنی کچەکەی نەکرد بۆ کوڕەکەی. ئەکاتە سەر گردێك و بانگ ئەکا ئەڵێ: «ئەرێ بێفەڕ! لەبیرم نەو کچەکەت داواکەم بۆ کوڕەکەم؛ ئێستە ئێژی چی؟» مراوەیسیش ئەڵێ: «وا دام وا دام». ئەمجا ئەلیوەیس بە دەستێکی دەستەکەیتری خۆی ئەگرێ و ماچی ئەکا بە جۆرێ کە شەقەی ماچەکەی بگاتە لای مراوەیس.

ئەلیوەیس دێتەوە ماڵەوە و بە کوڕەکەی ئەڵێ: کوڕە بێفەڕەی نەگریسە! هەڵسە بچۆ بۆ ماڵی دەزگیرانت، کچەکەی مراوەیسم بۆ خوازوێنی کردگیت. ئەویش ئەڵێ: بەبێ چتی سوور چۆن ئەچم. باوکی ئەڵێ: بێفەڕ! بۆم هاوردگی. ڕاست بوو، ئەو وەختە کە چووبوو بۆ بانە دوو گەز چیتی سووری بۆ هێنابوو. دایکی نافەکەی هەڵدێنێ و پارچەیەك

لەو چیتە ئەدروێ بە شوێن نافەکەیدا. ئەمجارە کوڕە هەڵئەستێ ملی مەڕێك ئەگرێ و ئەڕوا.

لە ڕێگادا شەکەت ئەبێ، لە بنە بەردێکدا سەر ئەنێتەوە تۆزێك ئەنوێ. لەو کاتەدا شوانێك سەیری ناو لنگی کوڕە ئەکا، دڵی لە چیتە سوورەکە ئەچێ ئەڵێ: وەکەلام ئەمە بۆ کیسە تووتن فرە خاسە. بەبێ چرپە دێت نافەکەی هەڵدێنێ و ئەیبا.

کوڕە، پاشان خەبەری ئەبێتەوە و بە خۆی نازانێ! هەر بەو جۆرە ئەچێ بۆ ماڵی دەزگیرانەکەی و ئەگاتە سەر بەرزاییەکا و دائەنیشێ، چاوی بە دەزگیرانی ئەکەوێ؛ سوورەی سەر قیتەی ڕاست ئەبێتەوە. دەزگیرانی پێی ئەڵێ: کوڕە بێفەڕ! سوورەت بشارەوە. کوڕەش ئەڵێ: ها ها، ئەمە نیو گەزی، دوو گەزی لە ماڵەوەیە. ئاخری کچەکە پێی ئەڵێ: کوڕە بێفەڕ گەڵوگونت بشارەوە!.

دایکی کچە بەم کارەساتە ئەزانێ، سەیر ئەکا کوڕە زۆر بەر بادە ئەڵێ: کوڕم بچۆرەوە دایکت بنێرە. کوڕە ئەچێتەوە و دایکی ئەنێرێ. دایکی کچە پێی ئەڵێ: کوڕەکەت زۆر بێئەقڵە، کارەساتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە. ئەویش ئەڵێ: ئەوە مەگەر تڕ و توخمی ئەو باوکە کەرەکەی نییە؟ من ئەم کوزەم بۆ ساف ئەکرد کەچی ئێوارە ئەوکە ئەهاتەوە فلق ئەیکرد بە قنگما. ئەویش هەر لەو باوکەیە!.

پاش ئەمانە کچە ئەگوێزنەوە بۆ کوڕە و کوڕە ئەچێتە لای. لە وەختی چوونە لادا سەر ئەکا، بەیانی باوکی کچە لە کچەکە ئەپرسێ: کە کوڕەکە بوو بە زاوا؟ کچەش ئەڵێ: نە. ئەمجا بە کوڕەکەی ئەڵێ: بۆچ زاوا نەبوویت. کوڕەش هەر لە شەوێوە جەیتەی سەر سووری خۆی گرتووە بە دەستەوە ئەڵێ: «چۆن نەوگم وە زاوا! ئەی ئەمە گووی تۆیە وەسەر کێرمەوە؟!».

**١٨.** بارام بەگی ئەحمەدبەگ بۆی گێڕامەوە وتی: چوومە شاری سنە کوڕێکی دۆستم هەبوو پێی وتم: لەلای ئێوە یاپراخی چاك لێ ئەنێن، تۆ وەسفی بکە با یاپراخێکی وەکوو لای ئێوە لەماڵی ئێمە لێ بنێن و بیخۆین. وتی: منیش ئەوی زانیم پێم وت. ڕۆژێ ناردی بەشوێنما چووین بۆ ماڵەوە؛ یاپراخەکەیان لێ نابوو، خواردمان و ئەم قسەیەی خوارەوەی بۆ گێڕامەوە، ئیتر نازانم زەرەری من بوو یا هی ئەو؟ وتی:

لەو سەرە دوو کابرا هەبوون دراوسێ بوون. یەکێکیان زۆر هەژار بوو ئەویتریشیان زۆر دەوڵەمەند بوو. هەژارەکە ژنێکی هەتا بڵێی جوانی هەبوو، کابرای دەوڵەمەند بۆی سووتا بوو. بەڵام هیچ هەلێکی دەست نەئەکەوت بۆی.

کابرای هەژار جووتە گایەکی هەبوو، ڕۆژێك یەکێ لە گایەکانی ئەمرێ و بە تەواوی پەکی ئەکەوێ. بە هەناسەساردی لێی دانیشت. کابرای دەوڵەمەندی دراوسێ بیستی و هات بۆلای و پێی وت: برام ئەوە چیت لێ قەوماوە وا بەو جۆرە کزیت؟ وتی: برا چیم لێ بقەومێ؟ بەو جووتە گایە ماڵ و منالم بەخێو ئەکرد، ئێستە یەکێکیان مردن ئەوا بە تەواوی پەکم کەوت. کابرای دەوڵەمەند هیچ دەنگی نەکرد و چووە دەرەوە. هەرکە ڕۆیشت لنگەگایەکی نایابی نارد بۆ کابرا. کابرا زۆری پێ خۆش بوو، دایە پاڵ لنگەکەی خۆی «جووت»ـی کەوتەوە گەڕ.

ڕۆژی دوایی هاتەوە بۆلای و وتی: گایەکم بۆ ناردیت وەرت‌گرت؟ وتی: وەرم‌گرت، خوا لە برایەتی کەمت نەکا و ماڵت ئاوا بێ! بوویت بەهۆی مانەوەی خۆم و ماڵ و منالم. وتی: برا ئەوە چ قسەیەکە تۆ ئەیکەیت؟ ئێمە دراوسێین، هەچ ئیشێکت هەبێ بەسەر سەرم. ئیتر ئەم گایە بوو بەهۆی دەرگا کردنەوە بۆ هاتوچۆ کردنی کابرا بۆ ماڵی ئەم پیاوە دراوسێیە

هەژارە و ڕۆژبەڕۆژ کابرای دەوڵەمەند زیاتر ماریفەتی ئەنواند.

ڕۆژێـك کابـرای هـەژار پێی وت: برام تۆ ئەوەنـدە چاکی لەگەڵ من ئەکەی ئاخر تۆیش با جارێ ئیشێکت بکەوێتە من، بەڵکوو منیش بتوانم تۆزێ جەزای ئەو چاکییانەت بدەمەوە. کابرا وتی: من هیچ ئیشێکم نییە یـەك ئیش نەبـێ. وتی: ئەی لە منت نەکـەوێ بیڵێ. وتی: ئاخر لە ڕووم هەڵنایـە. وتـی: بۆچ لە ڕووت هەڵنایە؟ مـن براتم بیڵێ. وتی: کەواتە چی بێ لە تۆ نهێنی بێ؟ من ئەم هەموو ماڵ و سامانەم هەیە، بەڵام نازانم بچمە لای ژن!. وتی: چۆن نازانی بچیتە لای ژن؟ وتی: بە کوردی نازانم گان بکەم. وتی: جا ئەوە چییە؟ ئەی لە منت نەکەوێ، چوونە لای ژن ئاوا و ئاوا ئەبێ. هەرچەندە لەگەڵی خەریك بوو، بۆی تێنەگەیەنرا هەر وتـی: نازانـم. وتی: ئەگەر ئەتەوێ فێـر ببم ئەبێ خۆت چۆن ئەکەی بەو جۆرە منیش فێر کەیت.

کابرا هەرچەندی کرد بۆی تێنەگەیەنرا؛ ئەمجا ناچار چووە لای ژنەکەی خۆی و وتی: ئافرەت خۆت ئەیزانی ئەم پیاوە چاکەیەکی زۆری لەگەڵ ئێمـە کرد و ئێستەش ئیشێکی هەیە ئەڵێ: نازانـم بچمە لای ژن. منیش هەرچەند پێی ئەڵێم، زۆر کەرە فێر نابێ. بۆ ئەوە جەزای پیاوەتییەکەی بدەینەوە تۆ فێری کە. ژنە وتی: پیاوەکە شتی وا چۆن ئەبێ؟ وتی: ئافرەت ئاخر ئەم پیاوە پیاوەتییەکی زۆری لەسەرمانە، من هەر مەبەستم ئەوەیە فێر ببێ.

کابرا بە هەرجۆر بوو ژنەکەی خۆی ڕازی کرد و ئەمجا چوو بە پیاوەکەی وت: بچۆ با ژنەکەم فێرت کا. کابرا چوو ئیشی خۆی تەواو کرد و هاتەوە. کابـرای مێردی پێی وت: فێر بوویت؟ وتی: «خوا تۆ خۆش کا وردەوردە فێر ئەبم!».

١٩. پیاوێك هەبوو لە شەقڵاوا چەرچی بوو، دووکانێکی گرتبوو تیایا دانیشتبوو، دەفتەرە شڕێکی هەبوو شتی بە هەرکەس ئەدا لەو دەفتەرەدا بە خەتێکی شەڕەپشیلە ئەینووسی. ڕۆژێك سەیری دەفتەرە کۆنەکەی کرد، تەماشایٚ کرد ئەوا «هۆمەر» ناوێکی تیا نووسراوە هەندێ پارەی لەلایە. کەوتەوە بیر کە ئەمە کام هۆمەرە و ئەم لە مێژە ئەم پارەیە لە لایە و چەند جاریش داوای کردۆتەوە هەر نەیداوەتەوە. خەنجەرەکەی هەڵئەکێشێ و نووکەکەی لەسەر ناوەکە دائەنێ و ئەڵێ: تۆ ئەو پارەیا ما دەی؟ دەبرێ نایدەم، تا نووکە دایکت بگێم، دە ئازای برێ نایدەم!.

٢٠. دوکتۆر عیززەددین مستەفا بۆی گێڕامەوە وتی: «مەلا عەلی حاجی ئەحمەد لاڵە» هەبوو لە سولەیمانی دراوسێی ئێمە بوو، کەوتبووەساڵەوە، خۆی ئەگەیاندە نەوەد. بیستبووی ئەگەر یەکێ دوا ئایەتی سوورەی تەوبە بخوێنێت ئەو ڕۆژە کە خوێندوویەتی نامرێت. جا نەوەکوو ڕۆژێك لە بیری بچێتەوە! هەر لە بەیانییەوە تا شەوێ کە ئەنوست، لە دانیشتنا و لە باسێك، شت کڕینێکی ببوایە ئایەتەکەی و قسەکەی بەیەکەوە پچڕپچڕ تەواو ئەکرد. زۆر جار نیوەڕوان کە ئەچووەوە بۆ ماڵەوە ژنەکەی لە ماڵەوە نەئەبوو، یا لەماڵی ئێمەوە یا لەماڵی دراوسێیەکی‌تر ئەبوو، بەم جۆرە ئایەتەکەی ئەخوێند:

﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ﴾ ئەو سەگبابە ﴿رَسُولٌ﴾ بەم نیوەڕۆیە ﴿مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ لە کوێیە؟ ﴿عَزِيزٌ عَلَيْهِ﴾، ئاخر ناڵێی ﴿مَا عَنِتُّمْ﴾ ئەم پیاوەی من ﴿حَرِيصٌ عَلَيْكُم﴾ ماندوو و برسییە و ﴿بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئاخر خەڵکینە ﴿رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ پێم ناڵێن جەمیلە لە کوێیە؟.

٢١. مەلا برایمی دۆڵاوی بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵێك چووم بۆ ئەو گەرمیانە بۆ مەلایەتی ڕەمەزان لە خێڵێکی تەرخانیدا. بە قسەی شێخ قادری کرپچنە بووم بە مەلایان. ڕەمەزان بەسەر چوو و جەژن هات. لە ڕۆژی عەرەفەدا خۆت ئەیزانی هەموو کەس ئەکەوێتە خۆی بۆ سەرورِیش تاشین و جلوبەرگ گۆڕین. لە دیوەخانەکەی ماڵی کوێخا ڕۆستەما ـکە دەوارێکی گەورەبوو ـ خێڵ کۆ بووەوە. دەروێش مارفێك هەبوو چەقۆ و هەسانەکەی هێنا، هەرکەسە سەر و ڕیشی خۆی ئەخووساند دەروێش ئەیتاشی.

خالۆ مارفێکیتر هەبوو سەر هاتە سەر سەرتاشینی ئەو. ئەویش سەر و ڕیشی خووساند و هات لە بەردەمی دەروێش‌مارفی سەرتاشا دانیشت. مارف سەرەکەی تاشی و هاتەسەر ڕیشی وتی: خالۆ مارف ڕیشەکەت بتاشم یا قەڵەمی کەم؟ ژنی ئەم خالۆ مارفەش لەو دیوی چیغەکەوە بوو، گوێی لە قسەکەی دەروێش‌مارف بوو، تا خالۆ مارف هات قسە بکا ژنەکەی سەری لە چیغەکەوە هێنایە ئەم دیو و وتی: ئەوە تۆ ئێژی چی؟ گووی تێکە گشتی بتاشە. خۆ مامۆسا نییە قەڵەمی ئەکەی!.

٢٢. مەلا ئەوڕەحمانێکی سەقزی هەبوو وتی: لەو دەشتی سەمگاوە لە تەنیشت درۆزنەوە خێڵێکی جاف خستبووی، چوومە ئەوێ سەیرم کرد شین و شەپۆڕە. پیاوێك لە خێڵەکەدا عەزەی قادریان پێ ئەوت، نەخۆش کەوتبوو لە گیانەڵادا بوو. هەموو خێڵەکە بەداخەوە بوون بۆی. ژنانیش کۆڕیان بەستبوو، بەسەریەوە ئەگریان؛ هەریەکە بە جۆرێ باسی چاکەی عەزەیان ئەکرد. خوشکێکی هەبوو فاتەی ناو بوو، فاتە زۆر بە کوڵ ئەگریا بۆ براکەی. ژنەکانیتریش هەر دڵیان ئەدایەوە و ئەیانوت: خوا ڕەحمی زۆرە ئیشەڵڵا شفای بۆ دێت و لەم نەخۆشییە هەڵئەستێتەوە.

فاتەش وتی: «خزمینە! من خۆم قیروسیا، ئەحەی مێردم لەو ڕۆژەوە ئەم برامە نەخۆش کەوتگە وەکوو کەرێ جاشکی تۆپیوی هەر لووشکە لووشکیەسی وە شەو و وە ڕۆژ ئارامی نییە، وەکوو پارگێنی دوای دەوار ئاو وە چاویا تێتە خوارەوە. دەسا خوایە لەبەر دڵی ئەو مێردەم ڕەحمێ وەم برامە بکەیت و لەم گلاراوە بخەڵسیێ!».

٢٣. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: ئەوا ترۆمبێلێکم هەیە لە شارەزوورەوە دێمەوە بۆ سولەیمانی. حەوت هەشت کەسم سواری ترۆمبێلەکە کردووە بە کرێ ئەیانهێنم بۆ شار. یەکێك لەوانە کابرایەکی خەڵکی ئاوایی «مستەفا» بوو لە تەنیشت منەوە دانیشتبوو، کەوتبووە ناو گۆمی خەیاڵەوە، مرقەی نەئەکرد. گەیشتینە سەرەوژوورەکەی «قرگە» ویستم گێڕی ترمبێلەکە بگۆڕم، کە دەستم برد لە باتی گێڕەکە دەعبای کابرام هات بەدەستەوە، ئەویش وەکوو گێڕەکە ڕەق بوو. توند گرتم و خستمە جووڵە! کابرا لە ناکاو هاواری لێ بەرز بووەوە وتی: «کورە دەویت باوك، کێرم بەرەڵا کە پسیام».

دانیشتووەکانی‌تر هەموو واقیان وڕ ما، منیش زانیم چ باسە ئەو هەر هاوار ئەکا و منیش ئەڵێم: کوڕی باوەحیزە بێ‌فەڕە! هەڵمەبلۆقێرەوە ترۆمبێلەکە وەرئەگەڕێ هەموومان ئەمرین. ئەوانەی دواوە کە دانیشتبوون ئەوانیش لە قسەکەی من کەوتنە ترسەوە بە چەپۆك بەر بوونە کابرا. ئەویش هاواری ئەکرد: «کوڕە سەگ‌باوکینە! ترۆمبێل وەرگەڕانی چی؟ من کێرم پسیا ئەم بێ‌فەڕە خوانەناسە کێر و گونی لە بن دەرهاوردم!».

٢٤. قادر حەمەومین لە شەقڵاوا ناردوویە ئەڵێ: جارێك دوو کابرا لە شەقڵاوا لەسەر تخووب ئەبێ بەشەڕیان. لە ئەنجاما ئەچنە

لای میر بۆ ئەوەی ناوبژیوانیان بکا. یەکێکیان ڕوو ئەکاتە میر و ئەڵێ: «میران ئەو کابرایە گەڕی تێ ئاراندیمە، ئەتۆ بەو ئەقرەی خۆت شەرعمان بکە، تخووبەکەمان تۆ دیاری کە. میران، ئەتۆ چێرە بی، بنە کرۆسکیش دە تۆدا بێ! چ گوو بخۆی چ کرۆسکات بخۆی هەر یەکە، من دەرێم هی منە و ئەو دەرێ هی منە. دە ئەتۆ دارێکمان دە ناودا بنێ با لەم شەکر خواردنە بکەوین!».

٢٥. لە «سیساوە» پیاوێك هەبوو «وەسمان»، ژنێکی هەبوو «گوستان»ـی ناو بوو. شەوێ دانیشتبوون گوستان وتی: پیاوەکە ماشەڵڵا لە شەرع قسەی لە هەموو شتێکەوە کردیە. ئیمڕۆ کە چووم بۆ ئاوێ و هاتمەوە گوێم لێ بوو مەلا وەعزی دەدا دەیفەرموو: هەرکەس بە شەوی هەینییان ـ حەیب نەبێ ـ بکاتن، قەسرێك لە بەحەشتی دروست دەکاتن. بەخودای پیاوەکە ئەوشەو هەینییە دەبێ قەسرێکم بۆ دروست بکەی. وەسمان خێرا قەسرێکی بۆ دروست کرد. گوستان وتی: دە بۆ خۆیشت دەبێ قەسرێك دروست بکەی. وەسمان قەسرێکی بۆ خۆیشی دروست کرد. پاش تۆزێك ژنە وتی: بەخودای پیاوەکە دەبێ لۆ دایکیشت قەسرێك دروست بکەی، هەقی بەسەر منەوە زۆرە؛ ئەگەر ئەو نەبایە من تۆم کوو دەست دەکەوت. وەسمان وتی: «ژنەکە ئەوە خۆت و ئەوە وەستای قەسران چی لێ دەکەی لێی بکە. ئیتر بەگوێی من ناکا، ئەگەر ئەتۆش درت بە داکم دەسووتێ بە خێرا بابت واز لە کوڕەکەی بێنە».

٢٦. لەو سەرە کوڕێك دایکێکی پیری هەبوو، هەر بە تەواوی پەکی کەوتبوو، هەموو دانەکانی کەوتبوون؛ چاوی کز بووبوو، برۆی هاتبووەوە بەسەر چاویا. کوڕەکەش کاروانچییەتی ئەکرد؛ هەرچەندە

ئەچوو بۆ کاروان و ئەهاتەوە دایکەکەی پێی ئەوت: کوڕەکەم دەنگوباس چییە؟ ئەویش ئەیوت: دایە هیچ نییە. پیرێژنە بەم دەنگوباس چییە دەنگوباس چییە، کوڕەی بە تەواوی وەڕز کردبوو.

کوڕەکە هاوڕێکی هەبوو چوو بۆی گێڕایەوە وتی: فڵانی دایکم حەیشی پێی تاڵ کردووم ناوێرم سەر بکەمەوە بە ماڵەکەدا. هەر کە ئەچم ئەڵێ: کوڕم دەنگوباس چییە؟ منیش ئەڵێم: هیچ نییە؛ بەڵام ئەو هەر واز نایەنێ. کوڕەی هاوڕێ وتی: کوڕە! من ئەزانم ئەوە بۆچ ئەپرسێ، ئەوە مێردی ئەوێ؛ دایکی منیش وا بوو. کوڕە وتی: شتی وا چۆن ئەبێ؟ ئەو سەری لە لێوی گۆڕەوە ئەلەرزێ مێردی چی؟ وتی: ئەوەیە پێت ئەڵێم. وتی: ئەم جارە کە چوویتەوە و لێی پرسیت: دەنگوباس چییە بڵێ: «دایە نازانم، ئەڵێن: فەرمانێك دەرچووە ئەبێ هەر کوڕێکی گەنج ژنێکی پیر بێنێت، بەڵام ئەبێ ئەو ژنە دە دانە گوێز بە ددان بشکێنێ. ئەمەی پێ بڵێ و ئیتر کارت نەبێ».

کوڕە چووەوە بۆ ماڵەوە و دایکی وەکوو جاران لێی پرسی: کوڕم دەنگوباس چییە؟ ئەویش وەکوو کوڕەکەی هاوڕێ پێی وتبوو، پێی وت. دایکە وەکوو گوڵاو بڕشێنی بەسەر دڵیا بەو جۆرە گەشایەوە وتی: دە کوڕم بچۆ دە گوێزم بۆ بێنە بزانە چۆنت بۆ ئەشکێنم. کوڕە چوو دە گوێزی کردە مستیەوە و خۆی چوو بۆ کاروان.

لە پاش پانزە ڕۆژێك گەڕایەوە و چوو بەلای دایکیەوە وتی: دایە چیت کردووە لەگەڵ گوێزەکانا؟ وتی: کوڕم یەکێکیان لە دەممایە و ئەیملکێنم نۆیشی ئەوەتە لە مستمایە.

٢٧. مەلا عەلی قوچە بلباسی گێڕایەوە وتی: کوڕێکی خارۆزام هەبوو دایکێکی پیری هەبوو. چووینە ئەوێ هەر بانگی داکەکەی

ئەکرد ئەویش نەدەهات. کوڕە تووڕە بوو وتی: دە وەرە پیرێژنە قۆلترە. ئەمجا هات و بە کوڕەکەی وت: «کوڕم پێم بڕێ قۆرترە، بەڵام مەڕێ پیرێژنە!».

٢٨. لەو بناری «دەشتەتاڵ»ـە لە دێیەك پیاوێك هەبوو سۆفی برایمی ناو بوو. عەمری خوای کرد. لە پاش شتن و کفن و شتە هەڵیان‌گرت بیبەن بۆ سەر قەبران. ژن و مناڵی سۆفی برایمیش کەوتنە تەك خەڵکەکە و چوون بۆ سەر قەبران. ژنەکەی سۆفی برایم ژنێکی جوانکەلە و ڕووەو بازاڕی بوو.

پیاوێکی جۆڵا هەبوو لە دێکەدا سۆفی ڕەحیمی ناو بوو. ئەویش لەگەڵ تەرمەکەدا چوو بۆ سەر قەبران. لە ڕێگادا مرخی خۆی خۆش کرد لە ژنەکەی سۆفی برایم و وردەوردە لەناو خەڵکەکەوە چوو بەلای ژنەکەوە و سەری قسەی لەگەڵا دامەزراند و لە ئەنجاما پێی وت: کە شووی پێ بکا. ژنەش وتی: ناتوانم قسەت بدەمێ؛ چونکە لە پێش تۆدا گفتم بە یەکێکی‌تر داوە. سۆفی ڕەحیم واقی وڕ ما وتی: ئەوە چ کەسێکە وا لە پێش ئەم وەختەدا گەیشتووە بە تۆو گفتی لێ سەندووی؟ وتی: «مەلا، لەو وەختەدا کە ڕەحمەتییەکەی ئەشۆرد، قسەی لێ وەرگرتم کە مێرد بکەم بەو. تازە ناتوانم لە قسەی خۆم پەشیمان ببمەوە».

٢٩. خێڵ سەرەوژوور بۆ کوێستان ئەگەڕێتەوە. ژنێکی باشکی «میمکەفاتمە» وەیا «میمکەپانێ»ـی ناو بوو. گایەکی داوەتە بەر و ئەگەیەنە سەر ڕووبارەکەی قزلجە. گایەکە ئەداتە پێش و دەست ئەگرێ بە کلکیەوە و لە بوارەکەوە ئەدات لە ئاوەکە. ئەگەنە ناوەڕاستی ئاوەکە، ئاو بەگوڕ ئەبێ، گا ئەکەوێتە شەکوشۆك. میمکەفاتە ئەڵێ: «سەی‌ساق مێیەك وە خەیری تۆوێ لەم ئاوە بپەڕینەوە»، تۆزێ لە نێرکی

ئاوەکە تێئەپەڕن، ئەڵێ: «سەیساق هەر لەسەر قسەی خۆم ماگم، بزنێك وە خەیری تۆ وێ وە بێمزەڕەتی لەم ڕۆخانەیە دەرباز وین».
هەندێکیتر ئەڕۆن، ترسی ئاو بردن کەم ئەبێتەوە ئەڵێ: سەیساق بێژی ئەوا لە ئاوەکە پەڕیگنەسەوە میمکەپانێ درۆم لەگەڵ ئەکا؟! هەر بچینە ئەو وەر ئاوەکەوە گێسکە وە خەیری تۆ وێ.

لەوانەیە بگەنە ئەوبەری ئاوەکە ئەڵێ: سەیساق خۆت ئەزانی هێشتا بەهار وە تەواوی نەهاتگە. «باڵاتەران»ـیش گەرەکیەسی، هەر تەشوێك گۆشتاو وە خەیری تۆ وێ.

کە ئەگەنە لێواری ئاوەکە، گایەکە بەردێك ئەکەوێتە ژێر پێی و پێی هەڵئەخلیسکێ و ئەکەوێتە ناو ئاوەکە. میمکەفاتە ئەڵێ: «ئەرێ سەیساق کوچکت لێ نەوارێ تۆ تەشویەکەت هاورد و من بۆم تێی نەکردی؟ ئەم کەتنە بێفەڕەت بۆچی گێرا؟!».

**٣٠.** هەر ئەم میمکەپانێیە ساڵی دوایی لەگەڵ عێلدا ئەچنەوە بۆ کوێستان. لەو ناوچەی «هۆبەتوو»ە پێش ئەوە بگەنە «شاقەڵا» گا بار ئەخەن و بۆ یەك دوو شەو ئەیکەن بە هەوار. سبەینێ مەڕ ئەدۆشێ و شیر ئەکاتە مەنجەڵەوە، ئەیەوێ بیخاتە سەر ئاگر، ئەگەڕێ بۆ بەرد بیکا بە سێ کوچکەی ئاگردان و مەنجەڵی بخاتە سەر. تەماشا ئەکا وا سێ بەردی قایمی درێژکۆڵە دانراون، چاوەکانیشی تۆزێ بیناییان کەم بووبوو، سێ بەردەکە هەڵئەگرێ و ئەیانهێنێ ئەیانکا بە سێ کوچکەی مەنجەڵ ئەڵێ: خوا ناردگیەسی. ئاگر ئەکاتەوە و مەنجەڵەشیریان ئەخاتە سەر.

زۆری پێ ناچێ بەردەکان گەرماییان ئەگاتێ، هەریەکەیان لە عاستی خۆیان ئەکەونە جووڵە و دەست ئەکەن بە ڕۆیشتن. مەنجەڵەشیریش

ئەرژێ بەو ناوەدا و بەسەر ئاگرەکەدا. میمکەفاتە هاواری لێ بەرز ئەبێتەوە و ئەڵێ: کورە عێل بێن وەرێوە سەیری ئەم مۆجزەیە کەن؟ سێ کوچکەی ئاگردانەکەم کەوتگنەسە ڕێ و ڕۆیشتن ها ئەوەسە ڕوویان کردە کەژەکە.

خەڵکەکە ئەم بانگەوازەیان بەلاوە سەیر ئەبێ! بە هەڵەداوان کۆ ئەبنەوە ئەڵێن: کچکە! ئەوەتۆ ئێژی چی؟ کوچك چۆن ئەڕوا؟ ئەویش بە سەری دەستی پەنجە بۆ بەردەکان درێژ ئەکا و ئەڵێ: ئەوە نییە داگیانەسە کەژەکە. ئەوانیش تەماشا ئەکەن لە کیسەڵ بەولاوە هیچی تریان بەرچاو ناکەوێ. ئەڵێن: میمکەفاتە کوا کوچك؟ ئەڵێ: ئەی ئەوە نییە ئەڕۆن؟ ئێژی چاوتان کوێر بووگە! ئەڵێن: میمکەفاتە کوچك لێی نەوارێ خۆ ئەوانە کیسەڵن تۆ هاوردگتن. ئەویش ئەڵێ: دەسا وەو سەیساقە خڕ و ساف و بتەو وون وامزانی کوچکن.

تومەز ئەمە کیسەڵ بوون و میمکەپانێ بە بەردی زانیون.

٣١. حاجی مەلا سەلامی مامۆستا مەلا حسێنی پیسکەندی بۆی گێڕامەوە وتی: ئەوا حاجی ئەحمەدی کڕنوو لەگەڵ حاجی شێخ ئەمینی «خاڵ»ـیدا ئەچن بۆ حەج و ئەگەڕێنەوە. ئەو سەردەمە بە کاروانی ولاخ ئەچوون بۆ حەج. ڕێگای کاروان لە گەڕانەوەدا دەشتی «سەنگاو» بوو، هۆبەی جاف ئەو دەشتەی داگیر کردووە، کاروانەکەی ئەمانیش لە لایەکەوە بارگە ئەخەن و شەو ئەمێننەوە. ناو و ناوبانگی شێخایەتی و پیاوچاکی حاجی شێخ ئەمین لەو ناوەدا بڵاو بووبووەوە.

ژنەکوێخا جافێك منالێکی بوو نەخۆش کەوتبوو، بە ناوبانگی حاجی شێخ ئەمینەوە هاتبوو بۆ ئەوە کە شێخ دوعای بەسەرا بخوێنێ و چاك بێتەوە. کە ئەگاتە جێ، حاجییەکانی تر ئەحەی کڕنوو بە ژنەکە پیشان

ئەدەن و پێی ئەڵێن: ئەوە حاجی شێخ ئەمینە. ژنە ئەچێ تەماشا ئەکا ئەحەی کڕنووی بەحاجی شێخ ئەمین بەو ناسراو پیاوێکی موبارەکی چەند تەڵەموویەکی درێژی سپی لە چەناگە دەرهاتوو، تەزبێحێکی بەدەستەوە لەسەر بەرماڵ ڕووەو قیبلە دانیشتووە. سەری داخستووە، چاوەکانی ناوە بە یەکا و لە موراقەبەدایە. منداڵەکەی فڕێ ئەداتە باوەشی و ئەڵێ: «یا شێخ! بیکە وە خاتری ئەو کەسە کە ئەو دەم و نەفەسەی پێ داگیت دوعایەك بخوێنە وەسەر ئەم منداڵەما با خاس بوێتەوە».

ئەحەی کڕنوو چاو بەرز ئەکاتەوە سەیرێکی منداڵەکە ئەکا، ئەمجا چاوی قیچ ئەکاتەوە و چاوی تێ ئەبڕێ، دەمی بۆ لار ئەکاتەوە دانی لێی ڕیچ ئەکاتەوە تەکەتەك ئەخا بەو چەند تەڵەمووە ڕیشەی کە هەیبووە؛ پاش ئەمانە پڕمەیەك ئەکا بەسەر منداڵەکەدا. منداڵ کە چاوی بەو سەر و سەکوتە ئەکەوێ و گوێ لەو پڕمەپڕمە ئەبێ، ئەداتە زیڕەی گریان و ئەچێتە تاسەوە. ژنە هەر هەڵئەستێ پەلاماری منداڵەکە ئەدا و ئەیڕفێنێتەوە و ئەڵێ: «بێرا منداڵەکەم هەی گووی دار و بەردت لێ وارێ و گوو وە ڕیشی باوك ئەو کەسە تۆی وە ئێمە نیشان دا. تۆ غەزەوی خوای! کەی شێخی دواوڕاوی؟ خۆ منداڵەکەت کوشت، هەی گوو وە ڕیش باوکت بۆ خۆت و شێخیەتیت!)».

٣٢. ئەحمەدی عەزیزاغا مریشکێکیان ئەبێ تاقە هێلکەیەك ئەکا و ئەکەوێتە کڕ، بەملادا ئەڕوا و بەولادا ئەڕوا هەر قرتەقرت و گارەگار ئەکا. وەڕەز بە ماڵەکە هەڵئەگرێ. ئەحمەداغا ئیتر لە وزەیا نامێنێ، هەڵئەستێ ئەیگرێ هێلکەیەك دێنێ ئەیخاتە ناو توورەکەیەك و ئەیکاتە ملی مریشکەکە و پێی ئەڵێ: «دە برۆ سەگباب! ئەوە خۆت

و ئەوە هێلکەکەت، وازمان لێ بێنە لەمە زیاتر ئیتر پێمان هەڵناگیرێ!».

٣٣. دوکتۆر کاوس قەفتان بۆی گێڕامەوە وتی: لەم ساڵانەی دواییەدا تازە «جلشۆر» (غەساله) کەوتبووە سولەیمانییەوە. «نامق»ی میرزا تۆفیق لەوێ ئەو جۆرە شتانەی ئەفرۆشت. ڕۆژێک کابرایەکی خەڵکی ئەو شارەزووری کۆنە هاتە بەر دووکانەکە و سەیرێکی ناو دووکانەکەی کرد و چوو بەلای جلشۆرە و هات بە سەروگوێلاکی جلشۆرەکەدا: کە وا جل ئەشوا و وا پاکی ئەکاتەوە و وا بێ ئەرکە. کابرا وتی: برا ئەمە بایی چەندە؟ نامیق وتی: بایی شەست دینارە. کابرا نەختێکی‌تر چاوی بە جلشۆرەکەدا گێڕا و سەیرێکی‌تری ئەملاوئەولای کرد، دەستێکی دا لە دەسکەکەی، گوتی: برا ئەگەر قسەیەك بێژم خۆ لێم ناگری؟ نامیق وتی: برا بۆچ لێت ئەگرم؟ چی ئەڵێی بڵێ ئەمە موعامەلەیە. وتی: «برا ئەمەی کە تۆ ئێژی شەرع شەرمی بۆ نییە گان ئەدا؟» نامیق هەر وا چووە تاسەوە وتی: برا ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ ئەمە ئاسنگە، گانی چی و شتی چی. کابرا وتی: «دە برا بڕۆ بەردی تۆی لێ نەوارێ، من کە شەست دینار بدەم، ئەیدەم وە ژنێك هەم جلم بۆ ئەشوا و هەم گانیشم ئەداتێ!».

٣٤. لەو سەرە دوو کابرای کورد چەند «گابار»ێك ئەدەنە پێش و ئەچن بۆ هەوارگەیەکی‌تر. دنیا شەو و ڕەمەزان ئەبێ، بەلای ئاواییەکا تێ‌ئەپەڕن. سەیر ئەکەن وا لەسەر بانێك نوێژ ئەکرێ. یەکێ لەم دوو کەسەش نوێژکەر ئەبێ، بە هاوڕێکەی ئەڵێ: تۆ لای گابارەکان ڕاوەستە تا من دوو ڕکات نوێژ ئەکەم و دێمەوە، ئەوجا ئەڕۆین.

کابرا ئەچێ و وا دیارە تووشی ئەبێ بە تووشی تەراوێحەوە، تا ئێستەش شتی وای نەدیوە. هاوڕێکەی بانگی لێ ئەکا: کورە بێ وەرێوە درەنگە.

ئەمیش هەر لەسەر بانەوە بانگ ئەکا ئەڵێ: «برا گابارەکان بووە و بڕۆ وا دیارە ئیشەکە بووە وە ڕقەبەری لە بەینی من و ئەو کاورای سەر چەرمگەدا؛ یا ئەوەسە ئەو من ئەدا وە زەویدا یا ئەوەسە من گووی تۆی لێ ئەوارێنم و ئەیدەم وە زەویدا!»

.٣٥ دوو پیاو هەبوون لە سولەیمانی مەلا عەلی حاجی ئەحمەد و مەلا مەحموودی حاجی مارف. ئەمانە هەر لە منالییەوە ڕەفیق بوون، بەڵام هەردووکیان کەڕ بوون وەیا بڵێین: گوێیان گران بوو. ڕۆژێ مەلا عەلی پەشتەماڵ و شتە ئەداتە بن دەست خۆی و ئەچێ بۆ حەمام. مەلا مەحموودی دۆستی تووشی ئەبێ پێی ئەڵێ: ئەوە ئەچی بۆ حەمام؟ ئەڵێ: «نەوەڵڵا ئەچم بۆ حەمام». مەلا مەحموودیش ئەڵێ: «وەڵڵا وامزانی ئەچی بۆ حەمام، دەبڕۆ خوات لەگەڵ!»

.٣٦ حەسەن بەگی جاف بۆی گێڕامەوە وتی: حەمەی ئەلی وەیس «بەجە» هەبوو لە هۆزی عەمەڵە بوو لەناو جافا. ئەمە سەرەتا شوان بوو پاشان دەوڵەمەند بوو و چووبوو بۆ حەج. بەولاوە بەسەر لوبنان و بەیرووتدا گەڕابووەوە. وتی: لێم پرسی: حاجی! لوبنان خۆشە؟ وتی: میرم لەوە خۆشتر هەر نەوگە. وتی: وتم: ئا بۆم باس کە. وتی: میرم نێرکە پیازی هەس هەریەکە وە قەد باڵێك. وتی: باڵیشی بۆ درێژ کرد. وتم: ئێ. وتی: ئاوی ساردی وای هەس کوڕێکی وەکوو تۆ لەشی پیس بوێ ناتوانێ مەلەی تیا بکا. وتم ئێ. وتی: ئێ...

.٣٧ شێخ عومەر گێڕایەوە وتی: دەروێش عەلی هەبوو لە «دەککە»ی ئەولقادربەگ هیچی نەئەزانی، بەڵام خۆی کردبوو بە مردووشۆر و بانگوێژ. پێی ئەڵێن: تۆ نازانی مردوو بشۆیت بۆچ لە خۆتەوە خۆت

کردووە بە مردووشۆر؟ ئەویش ئەڵێ: «چۆن نازانم، وەڵڵا قنگی ئەدڕم، تا ئێستە قنگی پێنج مردووم دڕیوە!».

**٣٨.** حەمەکەریم گێڕایەوە وتی: لەو بناری خۆشناوە کابرایەکی زرتەبۆز کچێکی مناڵکاری مارە کردبوو؛ بۆ شەوێ کە دەچێتە لای کچە، کچە ئازارێکی زۆری ئەگاتێ و خۆی ڕاناگرێ هاوار ئەکا: وەی مامە! کابرا ئەڵێ: کەسی مامی! کچە ئەڵێ: زۆر دەیەشێ. کابرا ئەڵێ: دەری بێنم؟ ئەڵێ: «نا». ئەڵێ: ئەدی زیاتر بیبەم؟ ئەڵێ: «نا». کابرا ئەڵێ: «دەسا کیژم! نە دەریکێشم و نە ڕاپێشی کەم، ئەدی خۆ لە کێری خۆم خۆش نابم!».

**٣٩.** مەلا عارف لە خانەقی بۆی گێڕامەوە وتی: زۆر زوو! پیاوێکی پیر پیر هەبوو لە خانەقی، «دۆسە»ی ناو بوو. ئەم دۆسەیە هەر لە مناڵییەوە زەمان هێنابووی بەسەریا بووبوو بە «کاکەیی». پاشان کوڕ و شتی هەبوو، یەکێ لە کوڕەکانی «نووری» ناو بوو. ئەم نوورییە مناڵ بوو سەردەمی شێخایەتی و زەرگ وەشاندن لە باوا بوو؛ خەلیفەیەك هاتە خانەقی و کۆڕی زیکری دابەست. نووری چووە ناویان و پێوە بوو؛ بوو بە دەروێش و گوێیان کون کرد و وەکوو دەروێشەکانیتر فێری «های و هوو»ی بوو.

دنیا ڕەمەزان بوو، خەڵك لەسەر بان ئەنوستن، هەڵسان بۆ «پارشیو» و بوو بە تەقوهۆڕی کەوچك و مەنجەڵی چێشت. نووریش لەم تەقەتەقە خەبەری بووە و دەستی کرد بە نووکەنووك وتی: بەڕۆژوو ئەبم. باوکی دوو سێ چەپۆکی کێشا بەسەریا و پێی وت: بخەفە بخەفە. کەڵکی نەبوو. نووری ئاگری ڕۆژوو هەڵیگرتبوو، خەوی لەوانیش حەرام کرد! ناچار دۆسە بە دایکەکەی وت: «هەستە نان و چایەك ڕای ئەی داڵك حیزە بکە».

ئەمجا لەبەر خۆیەوە هەر ئەیوت: «من لە کوو هووهوو لە کوو؟ من لە کوو ڕۆژە لە کوو؟ دەسا داود هەقم لە خوا بسەنی ڕای ئەی کەتنە!».

٤٠. شێخ محەمەدی شێخ جەلال بۆی گێڕامەوە وتی: لە مزگەوتەکەی ئێمە پیاوێـك هەبوو گەلـێ دەردیسـەری ڕووی تێـی کردبوو. هەموو پاش نوێژێـك ئەپاڕایـەوە لـە خـوا کـە چاکی کاتـەوە. جارێکیان نوێژی عیشا بوو، لە پاش نوێژەکە لە کاتی دوعا کردنا دەستی بەرز کردەوە وتـی: خوایە گورچیلەکەم چاك کەیتەوە، سپڵەکەم چاك کەیتەوە، ژانی پشتەکەم چاك کەیتەوە، پەراسووەکانم ژان ئەکەن، چاکیان کەیتەوە... ئیتر بەم جۆرە زۆری پێوە ڕۆیشت، دە دوانزە ئازاری هەڵ دا. حاجی محەمەدی عەنبەر لە تەنیشتیەوە بوو بۆی هەڵنەگیرا! لای لێی کردەوە و پێی وت: «مردووت مرێ! بۆچ خوا پینەچییە ئەم هەموو شوێنانەی تۆ پینە بکا؟ تا ئەمانە بکا دێنێ دە دوانزە زەلامی ڕێکوپێك دروست ئەکا و ئیتر چی داوە بەسەر ئەم جووت‌بەقیە و چوار پینەیەوە!».

٤١. پیاوێك هەبوو لە «سێ‌گرتکان» مامەحمەدی ناو بوو. چاوی نەیئەبینی. لێیان پرسی: «مامەحمەد» چاوەکانت چۆنن؟ وتی: «من خۆم هیچ نەوینم، وەلێ فاتە ئەوشێ: زەردە کەی!». فاتە، ژنی بوو.

٤٢. هەژار گێڕایەوە وتی: لە سەقز تازە دامودەزگای دانسازی داهاتبوو. ڕۆژێك حەمەعەلی‌بەگی خوڕخوڕە هاتبوو بۆ سەقز. حاجی فەتاحی سەقزی بانگێشتنی نانی نیوەڕۆی بۆ کردبوو. حەمەعەلی‌بەگ کە ئەچێ، تاقمەدانێکی تازەی دروست کردبوو. لە شوێنەکەی خۆی ددانەکانی شەوێ کە خستبووە ناو لیوانە ئاوەکەوە، بەیانی لە بیری چووبوو بیخاتەوە دەمی. لەسەر سفرەی نان‌خواردن پەکی ئەکەوێ و ئەڵێ: وەڵڵا

هیچم بۆ ناخورێ ددانەکانم لەبیر چووە. پیاوێکی تریش هەر لەوێ ئەبێ دەست ئەبا لە گیرفانیا خڕەخڕ دەستە ددانێك دەردێنێ و ئەیداتێ! ئەڵێ: بیخەرە دەمت ئابزانە چۆنە؟ حەمەعەلی بەگ وەری ئەگرێ و ئەیخاتە دەمی ئەڵێ: گەورەیە. کابرا دەست ئەبا لە گیرفانیا تاقمێکی تری بۆ دەردێنێ ئەڵێ: ئا بزانە ئەمانە چۆنن؟ ئەویش تاقی ئەکاتەوە ئەڵێ: وەڵڵا ئەمانەش بچووکن ناچێ بە دەمما. کابرا ئەمجارەش دەست ئەبا تاقمێکی تر دەردێنێ و ئەیداتێ ئەڵێ: ئەمانەش تاقی کەوە. حەمەعەلی بەگ ئەوانە ئەخاتە دەمی ئەڵێ: وەڵڵا ئەمانە زۆر چاکن و پڕ بە دەممن. پاشان لە کابرا ئەپرسێ ئەڵێ: برا تۆ چیت؟ وا دیارە دانسازیت. کابراش ئەڵێ: «نەوەڵڵا قوربان من مردووشۆرم!».

٤٣. شێخ مارف قەرەداغی گێڕایەوە وتی: پیاوێك هەبوو لە هەڵەبجە «سەعەچەقیگە»یان پێ ئەوت. لە پاشا خوا دایە و دەوڵەمەند بوو، حەجی کرد و لە ئاخری عومریەوە کچێکیشی هێنا؛ چەند شەوێکی پێ‌چوو ـ بلامانێ ـ هەر نەبوو بە زاوا. لە پاش بەینێك لێیان پرسی: خاڵە سەعە گەیشتوویتە کوێ؟ وتی: «برا لە سایەی قەوم و عەشرەتەوە سەرەکەی چەقیگە!».

٤٤. مەولوو هەبوو لە سنە سەردەمی گەنجایەتی بە ئەڵواتی و هەرزەیەتی ڕابواردبوو؛ کۆی لە هیچ خراپە و داوێن‌پیسییەك نەکردبووەوە. لە ئەنجاما بە تانووت لێدانی ئەم و ئەو هێنایانە سەر ئەوە کە ژن بێنێت. چوو کچی بێوەژنێکی مارە کرد. بێوەژنی خەسوو هات دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی و پێی وت: کوڕم! ئومێد ئەکەم ئیتر سەردەمی هەرزەگەریت بەسەر بچێت و جارێکی‌کە توخنی ئیشی ناشایست

نەکەوی. مەولوویش وتی: «ئامۆژن! ئەو زاوایەتییەی من لەگەڵ ئەم کچەی تۆدا ئاخر خراپەکاریم بێت!».

٤٥. مەلا ساڵحی میانەیی لە «جێشانە» مار پێوەی دابوو؛ حاڵی زۆر شڕ بوو، خستبوویانە ناو جۆڵانە و ڕایانئەژەند بۆ ئەوە مشك بەسەریا تێ نەپەڕێ. دەردەکەی ڕۆژبەڕۆژ گرانتر ئەبوو. هێنایان بۆ سولەیمانی بۆ لای دوکتۆر. دوکتۆریش ئەو وەختە دوکتۆر مەلیك بوو. دوکتۆر گەلێ بە داودەرمان لەگەڵیا خەریك بوو، کەڵکی نەبوو. لە ئەنجاما پێی وت: باوکم! مارەکە کوشندەیە، ئەگەر ئەتەوێ چاك ببیتەوە ئەبێ پیاڵەیە شەراب بخۆیتەوە. مەلا ساڵح وتی: شتی وا ناکەم. دوکتۆر مەلیك وتی: بۆچی. مەلا ساڵح وتی: ئەترسم بچمە جەحەنەم. شێخ بابەعەلی تەکیەیی لەوێ بوو وتی: «مردووت مرێ، ئەگەر نەشی‌خۆیتەوە هەر ئەچیتە جەحەنەم! کەواتە بە قسەی پیاوەکە بکە با ئێستە لەم دەردە ڕزگارت بێ تا سبەینێ خوا گەورەیە».

٤٦. لەو سەرە پیرێژنێکی پۆپ‌سپی لەبەر دەرگای ئەشکەوتێکا بووکەکەی سیپاڵێکی بۆ ڕاخستبوو، ساوەریان کردبوو. ساوەرەکەی لەولاوە لەسەر جامێك بۆ هەڵخستبوو، بێشکەی مناڵەکەی لەلایەوە دانابوو خەڕەکێکیشی بە هەندێ پەتکەوە خستبووە بەردەم. لەناو گڵێنەیەکا هەندێ قاوتیشی بۆ دانابوو. بووکە خۆی چووبوو بۆ مازوو کردن. پیرێژنەش کەڵپەکەڵپی بوو، هیچ ددانی لە دەما نەبوو.

ئەمجا پیرێژنە بە دەستی ڕاستی خەڕەکی ئەڕست، بە قاچی بێشکەی ڕائەژەند، بە دەستی چەپی پاسەچۆلەکەی ئەکرد لە ساوارەکە، لە بەینا پەتکی ئەدا بەدەم خەڕکەکەوە، جارجاریش گوێڵی قاوتی هەڵئەگرت،

ئەیبرد بۆ دەمی، بەڵام لەبەر ئەوە کە لەبەر لووتی ئەشکەوتەدا بوو بایەکە نەیئەهێشت هیچی بچێتە دەمی.

کوڕێکی قۆشمەش لە پاڵ دارێکا وەستا بوو سەیری کارەساتی پیرێژنەی ئەکرد. پیرێژنە پێی زانی لای وا بوو بۆ ئەو ڕاوەستاوە، ئەمجا بە چاویش دەستی کرد بە چاوبڕکێ کردن لەگەڵ ئەویشا. کوڕە ئێجگار لە قاوت خواردنەکەی سەری سڕ مابوو چونکە هیچی نەئەچووە دەمی. لێی نزیک بووەوە وتی: تازە شەمامە ئەوە چی ئەخۆی؟ پیرێژنەش جوابی دایەوە وتی: «گیانی تازە شەمامە، تا ئەم بایە لەم کونەوە بێ هیچ!».

**٤٧.** لەو بناری «کولیایی»ـیە دوو کابرای دەهۆڵکوت بێبازاڕی ڕووی تێکردبوون، بۆ زەماوەنێ، بۆ شتێك ئەگەڕان بە لادێکانا، هیچ نەبوو. بە لادێیەکا تێپەڕین سەیریان کرد پەڵەپیازێکی باش هەیە، هاتنە سەر ئەوە خۆ ئیش نییە با پیاز بدزین. کە چوونە ئاواییەکە خوا زەماوەنێکیشی ڕێك خست، بەڵام ئەوان لەسەر پیاز دزینەکەی خۆیان هەر جەخت بوون؛ یەکێکیان ڕووی کردە پەڵەپیازەکە و یەکێکیشیان چوو بۆ هەڵسووڕانی شاییەکە. کەوتە دەهۆڵ لێدان و شایی گەرم بوو. ئەوەی کە بۆ پیاز دزینەکە چووبوو سەیری کرد هەڵناکەنرێن. قۆزاخەکە لە زەوییەکەدا ئەمێنێتەوە بانگی کرد لە هاوڕێکەی وتی:

قۆزاخ سەختە وە دەر نەتێ    هەرچەن توام وەکەڵك نەتێ

ئەمیتریش بەدەم دەهۆڵ لێدانەوە بەم جۆرە جوابی دایەوە:

بچۆ جووە ئاو بەردە تێ    سەرەکەی نەرم وت بنەکەی دەرتێ
حەلەلەلەو    لەلەلەلەو    دویتەڵ کوڕەڵ کەفتنە ئەو

٤٨. مەلا سەلاح گێڕایەوە وتی: لەو گەرمیانە پیاوێك چووە لای مەلا وتی: قوربان خەوێکم دیگە خوا وە خێری بگێڕێ، ئێژم بۆت بگێڕمەوە بزانم تۆ چی لێی ئێژی؟ مەلاش وتی: «ڕۆڵە! "جَعَلَ اللّٰهُ بِالخَیْر"! ئادەی بیلێ بزانم چییە؟» وتی: مامۆستا ئەوا لە خەوما مانگایە، پارێنەیە، مێیە، بزنە، گوێرەکەیە، گشتی لەو دەشتەدا ڕمیاگن وە سەر یەکا ئەلەوڕێن.

مامۆستاش وتی: «برا خەوەکەت زۆر چاکە ئەوە ڕەشەوڵاخە!».

٤٩. «لالە سەرحەد»ی ڕوغزایی جارێك عەشرەتی کۆ کردەوە خەوی بۆ گێڕانەوە وتی: عەشرەت وا ئیمشەو لە خەوما وا ئەزانم مردگم، دوو بۆرەی چڵکنەی بێ‌فەڕە ئەتوت هورچن، هاتن وەلامەوە. بە هەقڵی خۆم تێ‌گەیشتم مەڕنەمووکەون، پیان وتم: مەڕنەمووکە؟ یانێ خوای تۆ کێیە؟ منیش فرە تووڕە ووم دەسێکم وە ڕیشە چەرموگەکەما هاورد و وتم: «ئێوە هیچ شەرم لەم ڕیشە ناکەن وا وا ئێژن؟ هەر ئەوەنەم زانی دوو قۆڵیان هەوو کردیان وە چوار و وەکوو جنۆکە ڕاوی ناون، وەرەو دوا وە دۆڵەکە وونەوە و ڕوەیشتن».

٥٠. شێخ محەمەد ئەمینی کاردۆخی گێڕایەوە وتی: ئەولعەزیز هەبوو لە تەوێڵە، کڵاشی ئەکرد. مەلا حەسەنی دزڵێ هەبوو، ئەچێتە لای ئەڵێ: جووتێ کڵاشم بۆ بکە شیعرێکت پێ ئەڵێم، ئەگەر ژنان هاتنە لات بۆ کڵاشەکەیان بەو جۆرە جوابیان بدەرەوە، ئەڵێ باشە. ئەڵێ بڵێ:

بە فیدای نازت بم وەگشت کەسمەوە

ئێنە لنگو تۆن ها وەدەسمەوە

٥١. حەمە نووری گێڕایەوە وتی: ئەوا لە کەلار بووین، تەوێڵەیەك هەبوو مەنجەڵە شکاو و شتی تێدا فڕێ درابوو. لەگەڵ ئەوەدا ماکەر و ڕەشەوڵاخیشی تێدابوو. وتی: شەوێك ڕێم کەوتە تەوێڵە ـ بەڵام خەیاڵی هیچ لە خۆم نەکەی ـ دنیاش تاریکە. سەیر ئەکەم وا حەسەن ـ شەروەت وێ لە ڕووتا ـ نیشتووە بە بەر ماکەرێکەوە. وتم: حەسەن ئەوە چی ئەکەی؟ حەسەن کە لە ناکاو ئەو دەنگەی گوێ لێ بوو ڕاچەنی. هەر ئەوەندە فریا کەوت دانەوییەوە، دەستی کرد بە دەستخشان بەسەر ئەرزەکەدا وتی: «بەخوا کاکە حەمە بۆ مەنجەڵ ئەگەڕێم!».

٥٢. نووری عەلی ئەمین گێڕایەوە وتی: وەستا حەمەسالْحێك هەبوو لە پێنجوێن کورتاندروو بوو. ئەم وەستا حەمەسالْحە ئافرەتێکی جوانکەلەی دراوسێیان هەبوو، مرخی لێی خۆش کردبوو. شەوێك ئەچێتە سەر جێگاکەی و دەست ئەبا بۆ سنگ و مەمکی. ئافرەت خەبەری ئەبێتەوە و ئەیناسێ ئەڵێ: کاکە حەمەسالْح ئەوە چی ئەکەی؟ ئەڵێ: وەڵڵا خوشکم ئەوە کورتانێکم دوریوە بۆ ئەو گوێدرێژەی کە لە تەوێڵەکەمانایە، دەستم لێ دا وتم بزانم ڕێکوپێکە. ئافرەتەش ئەڵێ: «کاکە حەمەسالْح هیچ وە بزانی سنگ و بەرۆکی من کورتانخانە و تەوێڵەخانەی تۆیە!؟».

٥٣. بابەشێخ گێڕایەوە وتی: لەو وڵاتی هەولێرە باوە، لە کاتی حەجا یەکێك حاجییان کۆ ئەکاتەوە ئەیانبا بۆ حەج و هەرکەسە و شتێکیان لێ ئەسەنێ، بەرانبەر بەو ئیش‌کردنە کە بۆیان ئەکا.

حاجی بەکر هەبوو کە ئەویش خەریکی ئەو ئیشە بوو، ڕۆژێ یەکێ لە دەڵاڵەکانی‌تر دێت بۆ لای و پێی ئەڵێ: حاجی بەکر تۆ هەموو حاجییەکانت ڕاکێشاوە بۆ لای خۆت و نانی ئێمەت بڕیوە. حاجی بەکریش تا ئەو

وەختە هەر پانزە حاجی بۆ کۆ کرابووەوە و ئەوانیش لە لای دانیشتبوون، هەڵئەداتێ ئەڵێ: نانی ئێوەم چی بڕیوە؟ من هەم و پانزە حاجی حیز، ئیتر لە کوێ هەمووم کۆ کردۆتەوە؟

حاجییەکان کە ئەمە ئەبیستن دەست ئەکەن بە جنێو و قسە وتن پێی و لێی ئەڕەونەوە. هەرچەند حاجی بەکر هاوار ئەکا کە مەبەستم هیچ نەبووە، کەڵکی ناگرێ. ئەو قسەیە خۆی بوو بە بەڵا بەسەر خۆیەوە. لە ئەنجاما وای لێ‌هات، کەس ڕووی تێ نەئەکرد و هەولێری بەجێ‌هێشت.

٥٤. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: ساڵێك چووم بۆ دەرەوە بۆ دەروێش گرتن. لە گوندێکا لەو بناری نزیکی «هەرکی»ـیە تووشی کوڕێکی گەنج بووم وتم: تەوبە بکە و ببە بە دەروێش. وتی: قوربان من هێشتا ژنم نەهێناوە و تەوبەم پێ ڕاناگیرێ. وتم: برام تۆ تەوبە بکە من بڕیارت ئەدەمێ تا ساڵێکی‌کە ئەم وەختە ژنیش دێنیت. وتی: بە هەرجۆر بوو ڕازیم کرد. تەوبەم دادا و بوو بە دەروێش. لە بەهاریا کە هێشتا ساڵی بەسەرا نەسووڕابووەوە چوومەوە بۆ ئەوێ، سەیرم کرد کوڕەکە جەزبە گرتوویەتی و بە زیکر کردن و هەیاهوو هات بۆ لام پێم وت: ها هێشتا ژنت نەهێناوە؟ وتی: «یا شێخ بەقوربانت بم! تۆم بۆ خۆش بێت ژنم بۆ چییە!».

٥٥. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: دوو کابرای هەرکی دوژمنی یەك بوون، بە خوێنی سەری یەك تینوو بوون. ڕۆژێك لە دیواخانی فەتاحاغای هەرکیدا بە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون. ئەمانە هەردووکیان قەندەکێش بوون، بەڵام یەکێکیان لەو وەختەدا قەندەکەی پێ نەبوو، بەری کرد بەولاوە دەستی بۆلای کابرای دوژمنی ڕاکێشا و وتی: «کیسکێ خۆ بدە من بلا قەندەکی چێ کەم، ییێل دلێ مندا بلا هەر لە دلێ من بی!».

٥٦. شەوکەت بەگ گێڕایەوە و وتی: ئیمساڵ کابرایەکی کەماڵەیی لای ئێمە چوو بۆ حەج؛ کە هاتەوە لێم پرسی: حەجەکەت چۆن بوو و چ دوعایەکت کرد لەوێ؟ وتی: شەوکەت وەگ فرە خۆشوو، لەوێ چوومە سەر قەوری پێغەمبەر ـڕۆحم وە قوروانی وێ!ـ فەڕ و بەرەکەتی لێ هەڵئەسا. دەسم بەرز کردەوە وتم: حەمەد ڕەسوولەڵڵا لەو کوردەواری لای ئێمە هیچ نەما، پیاو بوو کوژیا، خانگ بوو سووتیا، مێ بوو گشتی وە تاڵان بریا، بێژە وە خوا با ئیتر ئەم کەتنە بەس وێ. حەمەد ڕەسوولەڵڵا وەو قورعانەی تۆ لێت خوێندگە! لەو ڕۆژەوە تۆ مردگیت خوا ئیشێکی نەکردگە لە ئیشی پیاوان بچێ!.

٥٧. ئەزانی کێ بۆی گێڕامەوە وتی: مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە هەولێر فەقێیەکی لا بوو ئەیەویست ئیجازە وەربگرێ؛ ئەویش نەیئەدایە. فەقێکە چوو بۆلای مەلا ئەبووبەکر کە ئەو بە مەلای مامۆستای بڵێ ئیجازەی بداتێ. ئەویش چوو پێی وت. مەلا ساڵح وتی: ئیجازەی نادەمێ، ئەمە زۆر کەرە. وتی: کەرێتییەکەی چییە؟ وتی: کوڕە، ئەوە ڕۆژێك نێرەکەرێکی بردووە ئاوی بدا پێی ئەڵێ: «يا أُختي أَكلي الماءَ».

٥٨. شێخ فەتاح گێڕایەوە وتی: حاجی عەلی حاجی مینەی ڕوغزایی هەبوو، ساڵێك باران ئێجگار زۆر بوو، ئەویش مەڕوماڵاتێکی زۆری هەبوو. بارانەکە هەر خۆشی نەئەکردەوە، پێیان وت: حاجی عەلی باران لە چیدایە؟

وتی: برا لە چیدایە؟ ئاسمان دەڵەمیز بووە!.

٥٩. هەر ئەو حاجی عەلییە قڕان کەوتووە ناو ڕانەکەی. شەك مەڕێکی نایابی هەبوو زەنگۆڵەی کردبووە ملی، زۆری خۆش ئەویست.

ئەو شەكمەڕەشی مرد؛ جا ڕووی كردبووە ئاسمان ئەیوت:

شەكە سوورت بۆ كوشت؟ ئەمەش بۆ تۆ بزانم تێرت خوارد؟!.

٦٠. دوكتۆر مارف خەزنەدار گێڕایەوە وتی: ژنێك مێردی كردبوو، تازەبووك بوو، ڕۆژێك ئەچێ بۆ كۆڵ بۆ جل شتن. شەرم ئەكا بە خەزوورەكەی بڵێ دەرپێكەتم بدەرێ تا بۆت بشۆم، بەم شیعرانە ڕوو لەخەزووری ئەكا و پێی ئەڵێ:

**باوكی ئەو كەسەی كەوا من دەگێ!**

**دایكی ئەوكەسەش كەواتۆئەیگێی!**

**پێم شـــەرمە ناوی دەرپێكەت بێنم**

**تۆ گـــەورەی منی مەرگـــت نەبینم**

**داكەنـــە جۆڕكی كێـــر و گونەكەت**

**بۆ كۆڵ ئەچم لە چۆمی ســـەركەوت**

**بۆت ئەشۆم بە ئاو بە ئەسپۆنی جوان**

**بۆت ئەهێنمەوە دەمـــەو نیوەڕوان**

٦١. كابرایەكی خۆشناو ئەچێت بۆ ئەو گەرمیانە بۆ هەنار فرۆشتن. لە گوندەكە ئەچێتە بەرماڵی ماڵێك بارەكەی دائەگرێت و لە هەیوانەكـە بارەكـە دائەنێـت. گوێدرێژەكەش هەر لەوێ ئەبەستێتەوە، ئەمجا لەولاوە دەست ئەكا بە بانگەواز كردن. هەی هەنار سەربەسەر بە گەنم، وەرن دەنا دەڕۆم. ژنی ماڵەكە چەند دانەیەك هەنار ئەدزێت، كابرا چاوی لێ ئەبێت، بەڵام دەنگ ناكات. ئەگەڕێتەوە بۆلای هەنارەكان، لەو كاتـەدا كەرەكـەی دەسـت ئـەكا بە لووشكەلووشـك. كابـرا ئەڵێ: چەندم پـێ گوتـووی ئەگـەر چووینـە ماڵی خەڵك دەنگ مەكە و مەیەرە قسـە.

قەیدی چییە، هەناری بردووە، بردوویە ئیتر ئەم چەنەبازییە چییە؟ ژنەی خانەخوێ ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ.

کابرای هەنار فرۆش ئەچێتەوە بەولاوە دەست ئەکاتەوە بە بانگەواز کردن. چاوی لێ ئەبێ ژنە هەنارەکان ئەهێنێتەوە لە جێگای خۆی دایان‌ئەنێتەوە. دیسان کابرا دێتەوە بەلای هەنارەکانەوە. کەرەی بەستەزمان لە برسانا دەست ئەکاتەوە بە لووشکەلووشك کردن کە چاوی بەخاوەنەکەی ئەکەوێتەوە. کابراش ئەڵێ: وەڵڵا سەگباب خێو! ئاخری تۆ حەیای من دەبەی. دە هێنایەوە هێنایەوە، ئیتر با ببرێتەوە. ژنە هەر زۆر زۆر بەلایەوە سەیر ئەبێت. ئێوارە مێردەکەی لە ئیش ئەگەڕێتەوە هەموو کارەساتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، کە ئەو کەرە شتی وای کردووە و خاوەنەکەشی شتی وای وتووە.

ئەمجا مێردی دێت بەلای کابرای هەنار فرۆشەوە، پێی ئەڵێ: ئەرێ برام ئەوە ئەو کەرەت چۆن فێری ئەو گفتولفتە بووە، کەوا شتت بۆ بگێڕێتەوە؟ کابراش ئەڵێ: برا ئەوە لە ڕاستیدا کەر نییە، ئەوە ژنمە. کە ئەچم بۆ کاروان دوعایەك هەیە ئەیخوێنم بە سەریا ئەبێ بە کەر. بار و شتی لێ بار ئەنێم، کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە ئەبێتەوە بە ژن.

کابرای خانەخوێ ئەڵێ: دەسا قوربانت بم، من پیاوێکی هەژارم، هیچ بارەبەر و شتم نییە دوعایەکی واش بەسەر ژنەکەی منا بخوێنە، بەڵکوو ئەویش وای لێ بێت کە چووم بۆ ئیش، بار و شتی لێ بنێم و تۆزێ ئەرکم سووك ببێ.

کابراش ئەڵێ: باشە لەبەر ئەوە خزمەتتان زۆر کردووم، ئەم ئیشەتان لەگەڵ ئەکەم. بیهێنە من چیت پێ ئەڵێم وا بکە. ئەڵێ بیهێنە بیچەمێنەرە و سەری بگرە و چاو بنووقێنە ئیتر کارت نەبێ.

کابرا ژنە دێنێت ئەیچەمێنێتەوە، سەری ئەگرێ و خۆیشی چاو ئەنووقێنێ. کابرای هەنارفرۆش لە دواوە دەرپێی ژنە دائەکەنێ و تێی بەر ئەبێ. لەو کاتەدا کابرا تۆزێ چاو بەرز ئەکاتەوە سەیر ئەکا ئەم کابرایە بەر بووەتە ژنەکەی! هاواری لێ بەرز ئەبێتەوە ئەڵێ: سەگباب! ئەوە چی ئەکەی؟ کابرا کە ئەزانێ ئیشەکەی شڕە لە ترسانا بە نیوە و نیوەچڵی دەری‌ئەهێنێتەوە. ژنە هەر بەو جۆرە ڕوو ئەکاتە مێردەکەی و ئەڵێ:

«چیت کرد! زۆری نەمابوو گوێم درێژ بێ، قوت بووبوو، سمم خڕ بووبوو، هەر ئەوەندەی مابوو بانگم بکەی بڵێی کووڕوو، کووڕوو، چوش، چوش، بمبەی بۆ ئاشی، هەی پیاوی ناشی، وشوو وشوو، چووشوو، چووشوو!».

٦٢. مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە مزگەوت لە کۆڕێکا وەعزی ئەدا ئەیوت: بەهەشت لەوانەیە ئەگەر لەوێدا یەکێك ئارەزووی مریشکێکی سوورەوەکراو بکا، بەبێ قسە مریشکەکەی لە بەردەما حازر ئەکرێ. مام وسوو نوێژی ئەکرد گوێی لێ بوو. لە نوێژەکەی بووەوە وتی: «خۆ مەلا ساڵح پیاوێکی باش و ئاقڵە، ئەم قسە نابەجێیانە چییە ئەیانکا؟».

٦٣. شێخ نووری شێخ ڕەشید گێڕایەوە وتی: ڕۆژێك دوو کەس خەڵکی «نۆدشە» دێن بۆ سولەیمانی. یەکێکیان بەجێ ئەمێنێ و ئەویکەیان ئەگەڕێتەوە. لێی ئەپرسن: زۆراو ڕەفێقت پەی چێش نەیامان؟ ئەڵێ: «وەڵڵا ماچۆن سوار و بەڵای خوایی بیەن لوان پەیو قەوچەماڵی».

(مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ سواری فڕۆکە بووە و چووە بۆ چەمچەماڵ).

٦٤. کابرایەك لەو دەشتی دزەییە بەرجووتێکی هەبوو، لەبەر تەمەڵی بۆی نەئەدروایەوە. گەنم لەوانەبوو بە تەواوی هەڵوەرێ. دەر و دراوسێ ناچاریان کرد بەوە کە بچێ بیدروێتەوە. ڕۆژێك چوو دەستی دایە لەگەڵی خەریك بوو، چەند ڕۆژێك بەم جۆرە سەری خستە سەری.

ڕۆژێك یەکێ لە دراوسێکانی چووە لای و پێ وت: لە گەنمەکەت چیت ماوە؟ وتی: «ئەو سەرەی بیبەمە سەرێ و بیهێنمەوە، لێرەشەوە بیبەمە سەرێ و بیهێنمەوە، کلکە مەقریەکی دەمێنێ بایی پازدە ڕۆژانە».

٦٥. ڕەشەی ئەولاغا تا زەمان پشتی تێنەکردبوو، لە یەکەپیاوانی میراودەڵی بوو لە سوورەقەلات. «کێلی» دۆمەدێ بوو لە نزیکی سوورەقەلات. کچە دۆمێکی لێ بوو «مینا»، لەو ناوەدا ناوی دابۆوە. ڕەشی ئاغا ئەیەویست بیهێنێ و پرکێشی نەئەکرد. سەیرتر ئەوە بوو میناش بیستبوویەوە، ئەویش هەر ڕازی نەبوو. ئەم شیعرانەی بە ڕەشی ئاغادا وتبوو:

**دارەبەل و بەردەکۆز ڕەشید ئاغای سمێڵ بۆز**

**تۆ چیت داوە لە کچی قۆز**

ڕەشی ئاغاش بەم جۆرە وەڵامی دابۆوە:

**چی دی مەکە گاڵ و گورە ڕەشید پیر نییە هێشتا کورە**

**چاو بقووچێنە و لنگ هەڵبرە**

«بەردەکۆز»: دێیەکە لە مەرگە.

٦٦. لە دێی «بلەسەن» کوڕێك ژنی هێنا بوو. دراوسێکیان هەبوو ژن و پیاوێکی پیر بوون. شەوێ زاوا و بووك هەر قریوەی

پێکەنینیان بوو. ژنەپیرەکە لە درزی دیوارەکەیانەوە سەیری کرد بزانێ ئەم پێکەنینە چییە. تەماشای کرد وا کوڕەکە لەسەر گازی پشت ڕاکشاوە دەعباکەی خۆی کردووە بە سنگ و ڕاستی کردۆتەوە. بووکەکە چەند دانەیەك لە هەڵقەی ملیوانکەکەی خۆی دەرهێناوە، یەکەیەکە بە جۆرێکی وەستایانە ڕووبەڕووی دەعبای کوڕەکە فڕێی ئەدا ئەچێ بە کێری کابرادا؛ هەرکامێکی نەچێ پیا ئەوە سەری کردووە، لەو سەرکردنە پێکەنین ئەیانگرێ.

ژنەی پیرێژن مێردەکەی بانگ ئەکا و ئەڵێ: وەرە سەیر بکە. پیاوەکە ئەچێت؛ ئەمجا ژنە ئەڵێ: با ئێمەش گەمەیەکی وا بکەین. پیاوە ئەڵێ: باشە، بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی ئەوان بیکەین. ئەڵێ: تۆ پاڵکەوە من شت بۆ تۆ ئەهاوێژم. ئەڵێ: باشە.

ئەمجا ژنە لەسەر گازی پشت ئەکەوێ و پیاوە چەند گوێزێك هەڵئەگرێ، یەکە یەکە ئەیانهاوێژێ بۆ ناو (بلامانێ) ژنەکە. هەر کامێکی کەوتە ناویەوە ئەوا هیچ، ئەوی نەکەوت و سەری کرد لەمە دەست ئەکەن بە پێکەنین. بەم جۆرە ئەمانیش گەمەی خۆیان ئەکەن.

**٦٧.** لەو خۆشناوەتییە لە گوندی «هەرتەل» کابرایەك باوکی مردبوو، بووبوو بە شیوەن و شین و شەپۆر. نێرەکەرێکیان هەبوو لەو کاتەدا ئەویش ئێرەقی کردبوو وەکوو سنگی لێ هاتبوو بەرزی ئەکردەوە شڵپ، ئەیدا بەسەر سینەی خۆیا و بەری ئەدایەوە. کابرای خاوەنی و باوك مردوو هەر ڕاست بووەوە بە خەنجەرێکەوە پەلاماری دا و خەنجەری کرد بە ورگی نێرەکەردا جەرگ و هەناوی خستە ئەو ناوە وتی: «دایە ما خۆ بگێم! باوە مردیە بە وەی، وام بۆ دەرێ؟»

وتیان: ئەوە بۆچ ئەو کەرەت کوشت؟ وتی: ما خۆ دەرێ بابی تۆ مردیە یا نەمردییە بە کێرمەوە. منیش دایەلێی دەگێم وای لێ دەکەم، چما وا دەرێ بابی من چما لە کێری وی کەمترە؟ ئەو دایە حیزە وا دەرێ!».

٦٨. شێخ جەمالی ئەترووشی بۆی گێڕامەوە وتی: لەو شارەزوورە لە وارماوا بووم. پیرێژنێك هاتە لام شکاتی کرد کە هیزەیەڕۆنی هەبووە، دەروێش حەمەسەنی شاتری دزیویەتی و نامداتەوە. وتی: منیش ناردم دەروێش حەسەنم هێنا بە قسەی خۆش و بە لێدان نەچووە ژێری؛ سوێندی ئەخوارد وەکوو گەڵای دار بەخوا و بە پێغەمبەر کە نەیبردووە. پیاوێك لەوێ بوو هات پێی وتم: سوێندی بدە بە سەی‌ساق ڕاستییەکەت پێ ئەڵێ. منیش هێنام وتم: ڕوو بکەرە سەی‌ساق بڵێ: بەو سەی‌ساقە من ئەو ڕۆنەم نەبردووە. وتی: هەر ئەوەندەم زانی وتی: «دەسا قوربان من بردوومە» و چوو هیزە ڕۆنەکەی هێناوە.

پاشان پێم وت: تۆ ئەو هەموو سوێندەت بە خوا و بە پێغەمبەر خوارد بە درۆ! کەچی کە هاتە سەر سەی‌ساق ڕاستت وت، ئەمە چی بوو؟ وتی: «قوربان خوا و داروەدەستەی خوا لە پیاو ئەبگرن و ئەوەندە تووڕە نابن، بەڵام ئەو سەی‌ساقە بێ‌فەڕە دەس وە دەمی سەگا ئەکا. لە ڕاستی ئەو ناوێرم!».

٦٩. مەلا جەلالی مەلا حەسەنی ئابڵاخ لە سولەیمانی ڕۆژێ تووڕە ئەبێ ئەڵێ: ئەم مەلا نەگریسانەی سولەیمانی منیان کردووە بە بنێشتەخۆشەی ژێر ددانیان و هەر ئەڵێن: وایە و وایە و بێ‌فیکرە و شت نازانێ؛ نازانم بۆچ وا ئەکەن؟ لەو وەختەدا ڕوو ئەکاتە محەمەدی کوڕی ئەڵێ: ئا ڕۆڵە ئەو کەوشانەم بۆ بێنە. ئەویش ئەڵێ: «بابە وا لە پێتە!».

٧٠. لە گوندی «باشتەپە» لە نزیکی «پردێ»، عەبدولکەریم زیدبەگی گێڕایەوە وتی: دوو کابرا بوو بە شەڕیان، یەکێکیان بەوی‌کەیانی وت: «دایکت بگێم». ئەوەی کە ئەم جنێوەی دا دایکی خۆی وەستا بوو لەناو شەڕەکەدا بوو. ئەوی‌کەیان ـ واتە جنێو پێ دراوەکە ـ وتی: «دەسا وەڵڵا من بێزم نایە دایکی تۆ بگێم». ئەمجا دایکەکە پەلاماری بەردێکی دا و شالاوی برد بۆ کابرا وتی: «سەگی سەگباب! تۆ کوو بێزت نایە دایکی ئەو بگێیت؟»!.

٧١. خۆت ئەزانی جاف لە کاتی خۆیا گەرمیان و کوێستانیان ئەکرد. کاتێ کە ئەچوون بۆ کوێستان ئەو ڕێبازە کە ئەوانی پیا ئەچوون هەر دەغڵودانێکی لێ بوایە هەموویان لەناو ئەبرد و بە لاشیانەوە شتێکی وا نەبوو، لایان وابوو ماڵی گۆران خواردن گوناحی لەسەر نییە.

لەبەر ئەوە گەلێکیان دەروێشی شێخ کەریمی کرپچنە بوون، شێخ کەریمی گەورە وا ڕێ ئەکەوت ئەگەر یەکێ لە گۆرانەکان بچوایەتە لای، مەلا شکاتی بکردایە، مەلا ئەیتوانی کوردەی جاف بانگ بکا و پرس و جوابێکی لێ بکا. کوردەش لەبەر ئەوە قەمتەری شێخی لە دەما بوو ئەچوو.

مەلا قادری مەلا عەلی هەبوو مەلای «مەولاناوا» بوو، دوو شاخی گای هێنابوو هەر بە پێستەکەیەوە لە تەنیشت خۆیەوە دایانبوو. کاتێ کە یەکێ لە گۆرانەکان ئەهات شکاتی ئەکرد لە کوردێك، مەلا ئەینارد بەشوێن کوردەکەدا. کوردەش ئەگەر دەروێشی شێخ بوایە لە ترسی شێخ ئەچوو، مەلا شەرعی ئەکرد لە بەینی ئەو و گۆرانەکەدا. دیارە شەرع هەر بەلای گۆرانەکەدا ئەچوو، چونکە هەر کوردەکە بوو زیانی بە دەغڵی گۆرانەکە گەیاندبوو. بێگومان ئەمیش پێی ڕازی نەئەبوو. جا مەلا قادر هەر خێرا

ئەینەوی لە شاخەکان و لە سەری خۆی توند ئەکرد، ڕووی ئەکردە کوردەکە ئەیوت: «وەرە شەڕەقۆچ بکەین، ئەگەر من تۆم بەزان، ئەوا شەرعەکەم تەواوە، ئەگەر تۆیش منت بەزان، بەڕێی خۆتەوە ئەچیت و هیچ نادەیت». کابرا کە چاوی بە شاخ ئەکەوت ئەیوت: «مەلا، تۆ قازییەکی خاست هاوردگە، گا بۆر درۆ ناکا. خوا بتکا بە ساقەی شاخی گا بۆر و کەریمەسووری کەسنەزان». ئەمجا زیانەکەی ئەبژارد.

**٧٢.** کابرایەك هەبوو «مامۆتك»ـی ناو بوو، سیوشەش دەردی هەبوو. ڕۆژێك ئەچێتە سەر پێشاو ئەنقێنێ، کۆمی دەرئەپەڕێ. ئەوەش دێتە سەر سیوشەش دەردەکە. ئەمجا کە ئەوەی بینی وتی:

**بەخێر بێ سوورەگوڵی ناو باخان    بەسەر سەر و سەر چاوان**

**٧٣.** ئەمین چیتر هەبوو لە سولەیمانی ورگ و گەد و گیپاڵەکەی ناوبانگی دەرکردبوو، ئەیانوت: بە ژەمێ بەرخێکی بە بریانی ئەخوارد.

ڕۆژێك نیوەڕۆ برسی ئەبێ ئەچێتەوە بۆماڵەوە. لە ماڵەوە خورماوڕۆنیان کردبوو؛ بە ئەندازەی سەرەقلیانێکی بۆ ئەکەنە ناو دەورییەك و بۆی دائەنێن. ئەویش سەیرێکی ئەکا و چاوێکی پیا ئەخشێنێ و زۆر تێڕائەمێنێ. پاشان ئەڵێ: ئا توخوا لەولاوە جێگایەکم بۆ ڕاخەن و پەڕۆیەکیشم بۆ بێنن، ناساغم. ئەڵێن: تۆ ئێستە هاتیتەوە هیچت نەبوو، ئەمە چییە؟. ئەڵێ: پێتان ئەڵێم جێگاکەم بۆ ڕاخەن و پەڕۆکەشم بۆ بێنن. ئەڵێن: ئاخر چیتە؟ ئەڵێ: «کێرم ڕقیتەی کردووە، ئەمەوێ ئەم خورما و ڕۆنەی تێ گرم و بە پەڕۆکە بیبەستم، بەڵکوو خێرا چاك بێتەوە. ئەوەی ئێوە بۆتان داناوم مەگەر هەر وای لێ بکەم ئەگەینە بەشی هیچیتر ناکا».

٧٤. محەمەدی مەلا کەریم گێڕایەوە وتی: پیاوێکی قسەخۆش بۆی گێڕامەوە وتی: بێوەژنێکی تەڕپیر «خافاتم» ناو هەبوو، فێر بووبوو بە مێرد کردن. گەلێ مێردی کردبوو، جارێك لەگەڵ پیاوێکا -کە «حەمەڕەش»ـی ناو بوو و سەرە هاتبووە سەر ئەو- ڕێ ئەکەوێ مێردی پێ بکا، بەڵام بە مەرجێ کە هەر شەوێ -بلامانێ- پێنجی لەگەڵ بکا. بەم جۆرە قەول و قەرار ئەبەستن. هەر یەکەم شەو حەمەڕەش لە باتی پێنج، شەش ئەکا. جا بەیانی لەگەڵ مەلا بانگدانا خافاتم ئەچێ بۆ سەرکانی ژنان و چۆپی ئەکێشا و ئەم ویردەی ئەخوێند:

**گیانم حەمەڕەش، چاوم حەمەڕەش**
**قەولی پێنجمان بوو بۆی کردم بە شەش**

٧٥. شێخ محەمەدە شێتە هەبوو بۆ حەج ئەچوو. ژنێکی هەبوو «گوڵباخ»ـی ناو بوو، گوڵباخ پێی وت: زوو وەرەوە، ئاگات لە دوای خۆت بێ، شێخ محەمەدیش پێی وت: «من ئاگام لە دوای خۆم ئەبێ، تۆیش ئاگات لە بەری خۆت هەبێ!».

٧٦. محەمەد سدیق گێڕایەوە وتی: فلانی لەگەڵ «شینەخان»ـی ژنیا هەتا بڵێیت ڕێکوپێك و دەست لەملان بوون. فەنتازی تازە داهات و هەر ڕۆژە شتێك پەیدا ئەبوو. «کەنتۆر» داهات دنیا گۆڕا. سەرەڕای کەنتور، گەڕانی جووتقۆڵی پەیدا بوو، ئەوە پەیدا بوو کە ژنان لە ماڵا ڕۆژێکیان تەرخان کرد بۆ ئەوە دەستەخوشکان بێن بۆ لایان و ئەو ڕۆژەش ناو بنێن بە «قبوڵ»، نەك قبووڵی. چونکە قبوڵ قبووڵیشی تێدا بوو بە باقلاوا و پسکت و گالگالێ و ئەو شتانە کە باوباپیرمان هەر نەیانئەزانی چین. جاران ساڵی دوو کراس بوو، یەکێ زستانە و یەکێ هاوینە. ئێستە

-خوا نەیبڕێ- بوو بە ساڵی هیچ نەبێ چوار دەستە جلی عەلمۆدە. بێجگە لە جلە تەدارەکیانەکە شینەخان بۆ هەر قبوڵێك لە ماڵەکەی خۆیا بوایە، وەیا قبوڵ لە ماڵێکی‌ترا بوایە لەبەری ئەکرد.

کە دنیا ئەم هەموو گۆڕانەی بەسەرا هات، نووکەنووك و بۆڵەبۆڵی شینەخانیش ڕۆژبەڕۆژ زیاتری ئەکرد. ملی فلانی ئەگرت: بەهێ خان ئەو قاتەی لەبەر دایە، شلێر خان کراسەکەی لە سیمکاری لەندەنییە، حەفسەخان کەواکەی گروونییە، گوڵباتمانییەکەی وەستای عەلمۆدەی تازە داهاتوو دروویەتی. قاتەکەی من مۆدیلی نەماوە، بەزیاد نەبێ کرێشەی سەمفۆنیاش بووە بە قوماش من لەبەری کەم؟ جلوبەرگم نییە، ڕووت بم لەمەم باشترە.

فلانیش بەشەرە، لەگەڵ جموجووڵی ڕۆژدا ئەچێ بەرێوە؛ پاش عەسرێ بە شینەخانی وت: با بچین بۆ گەڕان. شینەخان وتی: بەزیاد نەبێ! بە چیمەوە بێم بۆ گەڕان؟ بۆچی جلم هەیە لەبەری کەم؟ فلانی ئیتر وەکوو بڵێیت پێی هەڵنەگیرا و تۆزێ توورە بوو، هەستا چوو بەلای کەنتۆرە تازە داهاتووەکەوە یەکێ لە دەرگاکانی کردەوە دەستی بۆ ڕاکێشا و لای کردەوە بەلای شینەخانەوە وتی: ئەوە هەموو جلوبەرگ و قاتی نایاب نییە هەڵواسراون؟ دەرگای دووەمی کردەوە هەروەها وتی: ئەمانە هەموو قاتی عەلمۆدە نین؟ دەرگای سێیەمی کردەوە، کاك تۆفیق لەناویا بوو! وتی: مەرحەبا کاك تۆفیق بەخێر هاتی! ڕووی کردەوە بەلای شینەخانەوە و دەستی ڕاکێشا بۆ لای کاك تۆفیق وتی: ئەوەش کاك تۆفیق نییە؟ ئیتر چۆن ئەڵێی هیچم نییە!.

(کاك تۆفیق دۆست و میوانی شینەخان بوو؛ عەسر لەبەر ئەوە کە فلانی لە ناکاو هاتبووەوە، شینەخان بەم دەمودەستە شوێنی دەست

نەکەوتبوو بۆ کاك تۆفیق تیایا هەڵیبگرێ، تەنها چاوی سێیەمی کەنتۆرەکە نەبێ. خوا خرابتر نەدا!).

٧٧. هێمن گێڕایەوە وتی: فەقێیەکی شێت هەبوو لە دەوروبەری سەردەشت، پێیان ئەوت: حەمەشێت. مەلایەکی باشیش هەبوو، مەلا شێخ عەلی ناو بوو.

ڕۆژێك شێتە بە مەلا شێخ عەلی ئەڵێ: مامۆستا ئیمشەو خەوێکی خراپم پێوە دیت. ئەڵێ: چی بوو؟ ئەڵێ: لە خەوما پێنج شەش کەس لێیان ئەدایت. مەلا شێخ عەلی ئەڵێ: ئەی لەسەرت نەکردمەوە؟ ئەویش ئەڵێ: «سەگباب! جا ئەگەر لەسەرتم نەکردایەتەوە بە شەق قنگیان ئەدڕیت!».

٧٨. «قانع» لە «حەمامیان» لە دیواخانی مەحمووداغادا ئەبێ. نیوەڕۆ نانێکی زۆر هاتە دیواخان، سەیر ئەکا مەحمووداغا خۆی بە تەنها لەسەر سینییەکە و نانی وشکی ئەخوا. ئەپرسێ: ئەوە بۆچ نانی وشکی ئەخوا؟ ئەڵێن: برین لە ڕیخۆڵەیا هەیە لەگەڵ قورحەدا. قانع سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و ڕوو ئەکاتە خوا ئەڵێ: «ئەوە ماڵ و سامان بۆچ نادەی بە من بیخۆم کە بەرد ئەهاڕم؟ بۆچ ئەیدەی بە مەحمووداغا و قورحەشی ئەدەیتێ بۆ ئەوە بۆت نەخوا؟ کەواتە تۆ دەست بە ماڵی خۆتەوە ئەگری و لەولاشەوە ئەڵێی من بەخشەندەم!».

٧٩. مەسعوود محەمەد گێڕایەوە وتی: مەلا ئەوڕەحمانێکی بانگبێژ هەبوو لە «کۆیە» دوو ژنی هەبوو. عاشقی ژنە گەورەکەی خۆی بوو. وای لێ‌هات کە خۆی بکوژێ. «مچەسووکە» هەبوو هەر لە کۆیە،

زۆر تووڕە و کەللەشەق بوو. مەلا ئەوڕەحمان وتی: چاك وایە بچمە لای ئەو بمکوژێ. چوو بۆلای و دەستی کرد بە جنێودان پێی. مچەسووکە بۆی ڕاست بووەوە و بە خەنجەرەوە پەلاماری دا. مەلا ئەوڕەحمان هەر کە چاوی بە خەنجەر کەوت هەلات و هاواری ئەکرد: «خەڵکینە! بۆ خاتری خوا بیگرن پەشیمان بوومەوە گووم خوارد!».

٨٠. حاجی حەمەمینی سیساوا گێڕایەوە وتی: حەمەداغای «سەرچیا» تۆزێ بزێو بوو. ڕۆژێك ئەچێتە لای قائیمقامی «ڕەواندز». ئەویش دەمێکە لە ڕاوی ئەوە دایە کە بیگرێ، ئەوا بە ئاسانی کەوتۆتە بەر دەستی.

کە دائەنیشێ قائیمقامەکە بە تورکی ئەڵێ: «توتن وێزنە». حەمەداغا هەر ڕاست ئەبێتەوە خەنجەر هەڵئەکێشێ و یەخەی قائیمقام توند ئەگرێ. قائیمقام ئەڵێ: ئەوە تۆ شێت بوویت؟ حەمەداغا ئەڵێ: «گەلێ جار بەوی توتنە گیرایمە» قائیمقام ناچار وازی لێ دێنێ.

٨١. شێخ عەلی گێڕایەوە وتی: ژن و مێردێك هەبوون سەردەمی گەنجایەتیان پێکەوە ڕابواردبوو، کەوتبوونە عالەمێکیترەوە. شەوێك ژنەکە بە پیاوەکە ئەڵێ: «بڕوا ئەکەی دەعباکەت باریك بۆتەوە». پیاوەش ئەڵێ: «وا نییە، بەڵکوو بلامانێکەی تۆ فراوان بووەتەوە».

٨٢. ئەفراسیابی ئەحمەدبەگ گێڕایەوە وتی: لەو سەردەمەدا کە شێخ مەحموود لە «داریکەلی» ئەبێ وتی: یەکێك بۆی گێڕامەوە لە بیرم نییە ئێستە، کە یەکێ لە شێخەکانی «سەرزەل» ئەچێ بۆ زیارەتی شێخ و ئەگەڕێتەوە، زۆر دوور ناکەوێتەوە لە داریکەلی، شێخیش وا دیار بوو لەسەر بانەکەوە بە دووربین سەیری ئەو ناوەی

ئەکرد. لە کاتی سەیر کردنا چاوی بە شێخەکەی سەرزەل ئەکەوێ، بە ڕێگادا ئەڕوا و کوتوپڕ لا ئەکاتەوە بۆ پشتی خۆی. شێخ سوارێك ئەنێری بەشوێنیا ئەیگێڕنەوە.

کە دێتەوە، شێخ لێی ئەپرسێ: ڕاستم پێ بڵێ لەو شوێنە چۆڵەدا کوتوپڕ لات کردەوە ترت نەکەندبوو؟ کابرا ئەڵێ: بەرێوەڵا یا شێخ ڕاستییەکەی وابوو، سەگباب خێوە هات ئاگام لە خۆم نەبوو. لا کردنەوەکەشم هەر ئاگام لە خۆم نەبوو، وتم: نەوەك یەکێك لە پشتەوە بێ و حەیام بچێ. دیار بوو وا تۆ هەبوویت. خوا ڕەحم بکا! شێخ دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: برۆ خوات لەگەڵ و خوا ڕەحمی کرد.

٨٣. لەو سەرە لە گوندی «ئەرادن» ئافرەتێکی ژیکەلە هەبوو، لەو ناوەدا ناوی دەرکردبوو. گوندەکەشیان جوولەکە و موسوڵمانی لێ بوو، بەو هۆیەوە «قەشە» و «مالووم» و «مەلا»شی لێ بوو. خاتوو تۆفێ زۆر جوان بوو، قەشە و مالووم و مەلا هەریەکە لە عاستی خۆیان مرخیان لێ خۆش کردبوو. خاتوو تۆفێ کارەساتی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە، مێردەکەشی وتی: چ قەیدی هەیە برۆ و دوا ژوانیان لەگەڵ ببەستە. لەو گۆشەشەوە چاڵێك هەڵئەکەنین، من ئەچمە ناو چاڵەکە و سەرەکەی بە گەڵا و شتە دائەپۆشین. هەرکامیان هاتن پێش ئەوە بێن بەلاتەوە بڵێ: ئەوە ڕەحمەتییەکەی مێردمە و ئەوەش قەبرەکەیەتی؛ بچۆ سەر بخەرە سەر چاڵەکە فاتیحەیەکی بۆ بخوێنە و بۆی بنێرە، چونکە حەقی بە سەرمەوەیە و دیسان لە فاتیحەکە ئیتر چاوی لێمان نابێ. کە ئەمەت کرد ئەو وەختە ئیتر من چاریان ئەکەم.

خاتوو تۆفێ ژوانی لەگەڵ جەماعەتا بەرودوا بەست. لە پێش

هەموویان قەشە هات. پێی وت: ئەبێ بچێتە سەر ئەو قەبرە کە هی ڕەحمەتییەکەیە فاتیحەیەکی خۆمانە بخوێنیت بۆ ئەوە چاوی لێ نەبێ. قەشە چوو، سەری شۆڕ کردەوە و نەکردەوە کابرا لە ژێرەوە چەقۆی ڕاکێشا و لووتی بڕی. قەشە هەڵات. بەشوێن ئەوا مالووم هات، مالوومیش هەروەها. پاشان مەلا هات، ئەویش هەروەها.

لە دەرەوە یەکیان گرت و لێك ئاشکرا بوون. مەلا وتی: مالووم خوا بتگرێ بۆ دەنگت نەکرد کە لە گەڕانەوەتا چاوت بە من کەوت؟ مالووم وتی: ئەی قەشە بۆ بە منی نەوت کە لە گەڕانەوەیا چاوی بە من کەوت؟ مەلا وتی: با دێزە بە دەرخوونە بێ، هەموو شتێك وایە ئەڵێ: بۆ هەر من بسووتێم؟

**٨٤.** لە حەنیفەخانمیان پرسی: چەند مێردت کردووە؟ وتی: «سیان و سیان و سێ لۆ لۆ، سیانیتریش مەحموو قایش، خواجەی بێڕیش، باوکی مناڵەکان ئەوانیتریش، دەستم لە هەویرە هەر ئەوەندەم لە بیرە!».

**٨٥.** ژنێك هەبوو لەو سوورسوورە کچێکی عازەبی زۆر بێئەقڵی هەبوو؛ بەدەستیەوە دامابوو. هەرچەندە ئامۆژگاری ئەکرد هەروەکوو گوێزی بۆ بژمێرن وا بوو. ڕۆژێك دایکەکەی دیسان دەستی کردەوە بە ئامۆژگاری کردنی و کچەش ئەوا دۆش داماوە هیچ دەنگ ناکا. دایکەکەی زۆری پێخۆش بوو وتی: شوکر وا کچەکەم گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرتووە و ئینشەڵڵا ئەم جارە قسەکان کاری تێکردووە و فێری سەروبەرێك ئەبێت. لەو کاتەدا کچە سەری بەرز کردەوە و وتی: «دایە، تا تۆ ئامۆژگاری من کردی من سیوسێ خەرنگەزە لە قنگ کەرەکەوە ژماردم!».

**٨٦.** کابرایەك ژنیان بۆ هێنا، ئەویش نەیئەزانی چۆن بچێتە لای و چی بکا. ماوەیەك بەم جۆرە مایەوە، هەر هیچی بە هیچ نەکرد. ڕۆژێـك پیاوێکـی دراوسـێیان پێـی وت: ئـەرێ خولە ئـەوە بۆچ هیچت دیار نییە؟ وتی: برا بێژم چی، نازانم ئەوە چییە و کامەسە. وتی: من پێت ئەڵێم: بچۆ بەلایەوە دەست بخەرە سـەر سەری بڵێ: ئەوە چییە؟ ئەڵێ: سەرە. پاشان چاوی، پاشان دەمی؛ تۆ دەست ئەخەیتە سەر هەر شوێنێك ئـەو ئەڵـێ ئەوەیـە. کـە سـەرەوخوار و بەو جـۆرە هاتیە خوارەوە دەستت ئەکەوێتە سەر شوێنێك بڵێ: ئەوە چییە؟ ئەویش ئەڵێ: نازانم، ئەوە بگرە و بەرەڵای مەکە، خۆیەتی.

ئەمجا کە شەو داهات، کوڕە چوو بەلای بووکەوە. وتی: بە پێم. بووکە دەستی برد تۆزێ مێوژی دایە، وتی: ئەوە نییە، بە پێم. گوێزی دایە، وتی: ئەوە نییە، بە پێم. هەر شتێکی دایە وتی: ئەوە نییە، ئەمجا دەستی خستە سـەر سـەری وتی: ئەوە چییە؟ بووکە وتی: سـەرە. دەستی گواستەوە بۆ سەر چاوی وتی: ئەوە چییە؟ وتی: چاوە. بەو جۆرە هاتە خوارەوە دەستی کەوتە سەر وانێکەکە وتی: ئەوە چییە؟ کچە وتی: نازانم.

کوڕە کۆرەك بوو، دەستی کرد بە هەڵگلۆفینی شوێنە و بە نقورچك تێی بەر بوو، وەکوو کوێری ئەسپێ لە مست کەوتوو، هەر هەڵیئەگلۆفی. کچە هاواری پێ‌کەوت، زیرەی ئەچوو بە ئاسمانا. لەم هەرایە خەڵکوخوا کۆ بوونەوە و دایکی کوڕەش هات. سەیریان کرد وا کوڕە بە هەردوو دەست بەر بۆتە ناو لنگی کچە و هەر وازی لێ نایەنێ، کچەش هەر هاوار ئەکا. دایکـی کـوڕە چـوو لـە دواوە یەخـەی کوڕەی گـرت و ئەیەوێ بیکێشـێتە دواوە، کـوڕە تونـد دوابـڕاوی کچـەی گرتـووە بـەرەڵای ناکا و کچـەش ئیتر شەرم و شتە نەما هەر هاوار ئەکا. دایکەش هەر کوڕە ڕائەکێشێ و بۆی

ناگەڕێتەوە دواوە، ئەڵێ: خوا بتگرێ کچی خەڵکیت کوشت بەرەڵای کە. ئەویش ئەڵێ: «وەو شێخ کەریمە دۆزیگمەسەوە وازی لێناتێرم».

بە هەرجۆر بوو کوڕیان لە کۆڵ کچە کردەوە، بەڵام تا لە کۆڵیان کردەوە کچەی بەستەزمان نیوەمەرگ بوو. کوڕەش هەر ئەیوت: «دەویت باوکینە! دۆزیگمەسەوە بۆچ نایەڵن بووم وە زاوا؟ دەسا هەر بووگم؛ شێخ لە پشتم وێ، ڕۆحم وە قوروانی وێ».

**٨٧.** ساڵێك زوو پشێوییەك پەیدا بوو لە عێراقدا، هەموو ئیش هاتبووە سەر چەپڵە لێدان. لە کەرکووك هەمهەمە و موزاهەرە بوو ئەیانوت:

«کریـم کریـم لِلأمـام        دیمُقراطِیّـه والسّـلام»

کوردەکانیشیان تێکڵاوی ئەو موزاهەرەیە کردبوو، نەیانئەزانی وەکوو خەڵکەکەیتر بڵێن ئەیانوت:

کەریم کەریـم لیلئەمام        دوو مەترەق و سێ زەلام

هەر لەو موزاهەرانەدا سوورەکان ئەیانوت:

حزبەکەمان «لینینییە»؛ کوردەکان نەیانئەزانی بڵێن ئەیانوت: «حزبەکەمان دینی نییە».

**٨٨.** پرسەیەك لە سولەیمانی ڕێکەوتبوو؛ کامەرانی شاعیر، ڕۆف مەعرووفی گەلاوێژ و موحەڕەم محەمەد ئەمین قسە ئەکەن بەیەك بۆ ئەوە پێکەوە بچن بۆ ئەو پرسەیە. لە ڕێگادا کامەران و ڕۆف بە موحەڕەم ئەڵێن: برا کە چووینە ئەوێ تۆ فاتیحەکە داخە. موحەڕەمیش گوێی گران ئەبێ سەرێکیان بۆ دائەنوێنێ یەعنی باشە. کە ئەچنە

ژووری پرسەکەوە، نە موحەڕەم دەنگ ئەکا و نە ئەوان. خەڵکەکەش چاوەڕێی ئەوەن کە ئەمانە فاتیحە دادەن؛ کەچی هیچ دەنگیش نییە. لە پاشا بەخێرهاتنیان ئەکەن، بەڵام لە پاش چی؟ لە پاش تەریق بوونەوەیەکی زۆر.

پاش هەستان کە دێنە دەرەوە موحەڕەم دەست ئەکا بە جنێودان بە کامەران و ڕۆف و پێیان ئەڵێ: ئێوە بە منتان نەوت: کە تۆ دەنگ مەکە، ئێمە فاتیحە دائەدەین؟ کەچی هیچ دەنگیشتان نەکرد و شەرمەزاریتان هێنا بەسەر منا. بەڵام من سووچی خۆمە ئەگەر من پیاو بوومایە لەگەڵ ئێوەدا نەئەگەڕام.



# ڕشتەی مرواری

**٨٩.** سەعات چواری شەوی دووشەنبەی ٢١ تەمووزی ساڵی (١٩٦٩) سێ کەس لە کەشتیوانەکانی ئەمەریکی چوونە سەر مانگ و قسەیان لەگەڵ دانیشتوانی زەویدا کرد. کوێخا سمایلێکی «عالایی» هەبوو لەو دەشتی دزەیی هەولێرە، ئەمەی نەچووە دڵەوە وتی: «خزمە، نابێ! نا، کوو غەیرەدین دەچنە سەر مانگ و دەچنە ڕۆخی؟ مانگ نووری خودایە لە ژوور چوار ئاسمانانە. خوا کوو نووری موبارەکی خۆی بەم کافر و زەندیقانە پیس ئەکا؟! ئەوی باوەڕیشی پێیان هەبێت بەحەشتێ بە چاوی نابینێ. ئەوە هەموو فرتوفێڵە ئەم فەرمەسۆنانە دایان‌نایتەوە بۆ وەرگێڕانی خەرکی. ئای هاوارم ماری وێرانم! کوو دینەکەمان زەعیف بووە؟ کافرستانی ڕابووە، مەگەر هەر خوا بە گەورەیی و مەرحەمەتی خۆی چاوی لێمان بێ ئەگینا چمان لۆ نەمایتەوە!.

**٩٠.** شێخ قادری شێخ «عبدالرّحمن» بە گۆزە ئەدا لە سەری شێخ ڕەزا، سەری ئەشکێنێ. ئەویش ئەچێتە لای شێخ عەلی برای ئەڵێ: کاکە! شێخ قادرە بۆزە سەری شکاندم بە گۆزە.

**٩١.** منالان یاری ئەکەن ئەڵێن:

**هەرکە نەیــە بۆ یاری     دایکی ئەبەین بە دیاری**

**بۆ شێخەکەی جەباری**

دیسان منالان کە شەڕە گەڕەك ئەکەن ئەڵێن:

**منالانی گەڕەك سەرپەڕی خەڕەك　وەرنــە دەرێ بۆ شــەڕە گەڕەك**

دیسان ئەڵێن:

**منالــی دەرێ وەرنــە دەرێ　پاشــا کوژرا بــە خەنجەرێ**

ـ منالان کە چاوشارکێ ئەکەن ئەڵێن:

**قـــەلا یــەك قـــەلا دوو　خواجە خــۆت بگرە دەرچوو**

**٩٢.** جامبازەکانی سولەیمانی کە کەرە گەڕێك ئەبرایە مەزاتخانەکە بۆ فرۆشتن، بەم جۆرە باسیان ئەکرد، لە پاش ئەوەکە دەستێکیان ئەماڵی بەسەر پشتیا ئەیانوت:

یا ڕۆحی بازاڕ و تەزبێحی پازار! ئەمە کەر نییە، ماینی مەحەنەکە چوار ناڵە ئەکا، لەگەڵ بادا سەما ئەکا. کەری میسری لە بەری هەڵدێ، خۆی ناگرێتەوە تا قۆریەشکاو. بەوری بەیان حەدی چییە، لە ڕووی ئەما ناوی نییە. بار هەڵگرە بە قەد کێوێك، وردە ڕەوتی هەر وەك دێوێك. ئالێکی ئەو توێکەڵە شووتی، بە قنیاتە وەکوو لۆتی. کەفەڵ پانە، سمت خڕە، لوولاق بەرزە، مل ئەستوورە، پشتی نانوێ، تۆ چیت بوێ ئەو وای ئەوێ!.

کورە ئەم کەرە کەر نییە لە دەستی خۆتی مەدە. گوێ درێژە، کلك درێژە، لموز بەرزە، ناوچاو پانە، چوار کاکیلەی هەیە، دوو لە سەرەوە دوو لە خوارەوە، وەرە سەیری کە، بۆنی دەمی کە سمڵ و سێپەڕە وا لەناو دەمیا. تاکوو نەیبینی نازانی چییە، بە سیودوو تارانی مەزات بە سیوسێ تارانی لەسەر تۆیە بە سیوچوار تارانی دە برۆ خێری لێ ببینی.

کابرا: بەخودای مامۆستا بە گۆڕەبابم! ئەمە بە دەرس نەخوێنرێ لەبەر ناکرێ.

مامۆستا: بەخودای برام، بە گۆڕەکاکم بە دەرسیش بخوێنرێ هەر لەبەر ناکرێ.

**٩٣.** کابرایەکی «نەمەڵ»ی ئەکەوێتە ناوچەی «کۆیە» و ئەچێتە ناو شار شتومەك بکڕێ. لە هەندێ لە شێوە قسەکردنی کۆیە سەری سڕ ئەمێنێ! هەر لەبەر خۆیەوە ئەڵێ:

**کەوتوومەتە ناو کۆیە بە فڕو فێر   مانگایان لێ کردووم بە چێر**

**خاکەنازیان لێ کردووم بە بێر   ساجیان لێ کردوومە بە سێر**

**ئەمە شار بوو من کەوتمە ناوی وەکوو کوێر**

**٩٤.** «عەزەوەیلێسە» هەبوو خەڵکی سولەیمانی و لە سەردەمی تورکەکانا زەفتیە بوو. کە ئەهاتە وەختی قسە کردن، قسەکانی گەلێ زلتر بوون لەوە کە زەفتیە بوو. کە بیاننارادیە بۆ شوێنێکیش ناوکی ئەکەوت. جا ئەم عەزەوەیلێسەیە ئەیوت:

ئەمە چییە؟ حوکوومەت ئەمان نێرێ بۆ دەوری کۆڵیتان و مۆڵیتان تەمتەمانە و سیکسپان بە لاکەل و جانبێزار، ڕۆژمان ئەکەنە شەوی تار، نامان نێرێ بۆ مەسەکانی ساڵحی فەیزە و بۆ دۆڵاشی ئەمینی ئەلیوەیس و بۆ تەپەکەلی شێخ. ڕاستییە و دەشتی پان، کەسێ نییە بڵێ کوان. گیزەی تفەنگی مێشوولەیە، هەوهەوی سواری کێچوولەیە، نە چەتەیە و نە دەنگی پێت، ناچێتە ئاوزەنگی ئێش و کارمان هەر خواردنە لەو ماوەیە هەر نوستنە.

**٩٥.** قادر حەمەمین لە شەقڵاوا ناردی وتی: پیاوێك چیرۆکبێژ هەبوو لە شەقڵاوا ناوی «عەول» و خەڵکی سولەیمانی بوو، کە چیرۆکی ئەگێڕایەوە و حەقایەتی ئەخوێندەوە ئەگەر باس، باسی دڵداری

و عەشق بوایە ئەمەی خوارەوەی ئەکرد بە سەرەتای حەقایەتەکەی و ئەیوت:

**یادی بە یادی تەختی مرادی**
**خواردنی کاردی بە ئاوی ساردی**
**خەوی لبادی ئاوی لە دێمکی**
**سێبەری بن کەپکی**
**ماچکردن لەکچی خەڵکی**
**بە مەلای گەرمیانێ**
**بەفەقێ کوێستانێ**
**کێری جوویێ بە قوونی دیانێ**
**ئەو یار لە ئەستۆی ئەو مامۆستایەی کە من لێم زانێ**

ئەمجا ئاغەم بگەڕابایی هەکشاوێ داکشاوێ، شۆخوشەنگێ، نەرمونۆڵێ، خڕوخۆڵێ، بە لوتفی شیرین، بە زمانی شەکرین دایم قەندی لە لێوی دەباری.

ئینجا ئاغەم مەپرسە! چ ناسك سەنەمێك بوو؟ خۆخ بەدەمێك بوو؟ هەنارمژێك بوو؟ چاوی دەتوت پیاڵەیە، کەپووی دەتوت قەڵەمە، ددانی دەتوت سەدەفە، چەناکەی دەتوت گۆیە، گەردنی دەتوت بلووری سێ نمرەیە دەیسێ، سینەی دەتوت قاقەزی سەمەرقەندێیە، دوو لیمۆی لێ نەسب کرایە، یەکیان تامی شەکری لێ دێ یەکیان تامی هەنگوینێ.

ئەوجا ئاغەم! دەستەکی بە سنگی دەنا، لاقی پێ کردە دەستی دوعاکەری بەیانێ! هەرچەندە هەرگێڕی کرد و وەرگێڕی کرد کونەکەی نەدۆزییەوە. ئینجا دەستی دە چەکمەجەیەکی ڕا کرد، دووربینێکی هەشت تەرخانی هێنا دەرێ، دایە پێش چاوی، دووری نۆڕی، نزیکی نۆڕی، چۆن دەرەزێکی لە شووشەی دابێ بەو میساله دەرەزی؛ ئینجا دوڕی لە یاقووتی گیر کرد،

یاقووتی لێ بە کەرتك کرد. ڕووباری ماوەرانێ وە گۆمە تەنگی کرد دوو بە وەی، یەکێ بەوەکەی خۆی.

خۆ ئەگەر حەقایەت، داستانی پاڵەوانی و شەڕوشۆڕ بوایە ئەمەی خوارەوەی ئەکرد بە سەرەتا:

ئەو ڕۆستەمی داستانە، ئەو پاڵەوانی زەمانە، گورزی هەڵسووڕاند و دایهێنا، لەگەڵ ئەستێرانی جووت ئەکرد. پرژی ئاگری لێ دەباری کە لێی دا، خستی. جووتە چۆکێکی ئەوتۆی لە دەفەی سنگی دا، یەکێ ئەوتۆی لێ بەر دا، گاسنی تەوریزێ پێ سوور بکرێتەوە.

**٩٦.** جارێك مەلا ساڵحی حەریق و مەلا ئەحمەدی لاسوور پێکەوە ڕەفیق ئەبن. مەلا ئەحمەد هەندێ هەنجیری پێ ئەبێ، لە مەلا ساڵحی ئەشارێتەوە و بەشی نادا. نزیکەی ساڵێك بەسەر ئەمەدا تێئەپەڕێ. ڕۆژێك لە «مەرخوز» لە مەدرەسەی فەقێکانا هەموو پێکەوە دائەنیشن. یەکێك لە فەقێکان تەفسیرێکی «بیضاوی» دێنێ و قسە لە سوورەی «والتّین»ـەوە ئەکەن. مەلا ساڵح بەیزاوییەکە وەرئەگرێ سوورەتەکە ئەخوێنێ و ئەڵێ: ﴿وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ﴾. مەلا ئەحمەد ئەڵێ: کەی وایە بابە. سوورەتەکە ئەڵێ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ﴾. مەلا ساڵح ئەڵێ: «ئاخر ئەوە بوو پار تۆ «تین»ـەکەت ئەشاردەوە!». ("تین": هەنجیرە).

**٩٧.** لەو وڵاتی «مامش»ـە گوڵەخانم هەبوو. گوڵە لەگەڵ گوڵدا لەسەر نازکی و جوانی خۆیان هەر لە شەڕدا بوون. لە هەموو مەنگور و مامشدا تەنها گوڵەخانم هەبوو، گوڵەی ئەدیب و شاعیر و زیرەك و شاژن هەر ئەو بوو.

ئەم گوڵەخانمە مێردێکی هەبوو، مێردە بەهۆی هاتوچۆ کردنی بۆ تەورێز و مەورێز فێری هەندێ بەدعەمەلی بووبوو. جارێك لە گەڕانەوەی لە تەورێزدا هەتیوێکی جوانکەلەی تەورێزی بە دیاری بۆ خۆی دێنێتەوە. گوڵەخانم لەسەر ئەمە گەلێ سەرزەنشتی ئەکا، هیچ کەڵك ناگرێ. جارێك گوڵەخانم ئەچێتە ژوورەوە سەیر ئەکا جەنابی مێردی لەگەڵ هەتیوەکەدا نوستووە. ئەمیش بۆ تانە و تەشەر ئەم هۆنراوەی خوارەوەی بۆ ئەنووسێ، لە ژوور سەریەوە دایئەنێ و خۆی ئەڕوا. ئەنووسێ:

**ئەو کوڕە جوانەی کە ڕوومەت گوڵە**
**بنووم لە ژێریا و بڵێم ئەی دڵە**
**بڵێ بە میرزا بەشی کەین نێری**
**کونی دوای بۆ ئەو بۆ من بێ کێری!**

٩٨. مەلا سالحی حەریق کتێبی «گَلَنبَوی» لە مەلا عەزیز موفتی سولەیمانی وەرگرتبوو. هەرچەندە مەلا عەزیز داوای ئەکردەوە ئەو هەر نەیئەدایەوە. لە ئەنجاما حەریق بە زمانی مەلا نەسروڵڵای باوکیەوە ئەم دوو بەیتەی دانا و وتی:

**بابی کوڕێکی بوو چ کوڕ؟ ئەربابی مەعنەوی**
**ئەیوت لە ڕووی نەسیحەتەوە دائیما بە وی**
**وەك جەردە بی دە ڕۆڵە لە عومری منت کەوێ**
**نەیدەیتەوە بە موفتی ئەفەندی گەلەنبەوی**

٩٩. حەمە چاوزاق هەبوو لە سولەیمانی لە مەیدانی ماست فرۆشەکان «پەتاتە»ی ئەفرۆشت. کە بانگی بۆ ئەکرد ئەیوت: «ئامۆزای هێلکە پەتاتەی کوڵیو، خاڵۆزای چەونەر پەتاتەی کوڵیو، هێلکەی

مانگا حەڵەب پەتاتەی کوڵیو، نەجیب زادەی ئەرز پەتاتەی کوڵیو، حەلوای بێ ددان پەتاتەی کوڵیو!».

.١٠٠ شێخ «عبدالرحمان»ی «جانەوەرە» ئەچێ بۆ سەفەر. بە ڕێگادا ئەڕوا کابرایەکی بەرازخۆری قەڵخانی خۆی و دوو ژن تووشی ئەبن. کابرا سەری ڕێی بە شێخ عەبدوڕڕەحمان ئەگرێ و پێی ئەڵێ: یا شێخ! ئەمانە هەردووکیان ژنی منن، مناڵمان نییە. کاغەزمان بۆ بنووسە بۆ سەر مەرقەدی مەلا مستەفای بێسارانی بۆ مناڵ. شێخ عەبدوڕڕەحمانیش ئەم دوو شیعرەیان بۆ ئەنووسێ و ئەیداتە دەست کابرا و ئەڵێ: بیخەرە قسنەکەیەوە:

**بێساران ماوا شێخی بەحر و بەڕ   ئاما وە یانەت یەکانە و دوو دەڕ**
**جە دەوری یانەت مەکەران هۆڵە   پێشان کەرەم کە جووتێ یارکۆڵە**

کابرا و ژنەکانی ئەڕۆن و کاغەزەکە ئەخەنە قسنەکەوە. لە پاش دوو سێ ساڵ شێخ عەبدوڕڕەحمان ڕێی ئەکەوێتە ئەو ماڵە قەڵخانییە. کابرای قەڵخانی خزمەتێکی زۆری ئەکا و دوو کوڕی مناڵ دێنێ و لە بەردەمیا دایانئەنێ ئەڵێ: بم وە ساقەت! ئەم دوو کوڕە ئەنجامی نوشتەکەی تۆ بوو، کە بۆ قسنەکەی بێسارانیت نووسیو. دەڕ: دێڵەبەراز.

.١٠١ ئەم هۆنراوەی «مەولەوی»ـیە لێك بدەرەوە:

**من هەر تۆم هەنی نەواچی تۆم بۆ   تۆم بۆ چەنی عام نیام چەنی تۆ**

.١٠٢ ئەم هۆنراوە هی کوێخا جافێکی سەر بە حەمەپاشای جافە بۆ میروەیس ناوێکی نووسیوە، کە ئەویش سەر بە حەمەپاشا بوو؛ بەڵام لێی هەڵگەڕابووەوە.

**دەم بــۆری دوم بـــاز وە تورکـــی تێلکی**
**من دەرچووم لە ملْك تۆ بووی وە ملْکی**

باز: واتە بازگ. تێلکی: ڕێوی. ملْکی: کارەکەری ماڵی سلێمان‌بەگی حەمەبەگی حەمەپاشای جافە و ناوی بە سووك دەرچوو بوو.

.١٠٣ ئـەم پارچـە هۆنـراوەی خـوارەوە هـی هۆنەرێـکـی کـورد «مـەلا غەفووری سابڵاخی»ـیە [حافیز]، نیوەی یەکەمی تووڕە بوون ئەدا، لە نیوەی دووەمیا ئەیهێنێتەوە و ئاشتی ئەکاتەوە. من لە ژێر ناوی «خەشم و ڤیان» وەیا «خوسپ و وەسپدا» ئەیکـەم بـە پارچەیەکـی ئەدەبی لە سامانی زمانی کوردی:

**تـــا بژییم تێت ئەبـــڕم خاوەنی جوانی و دەســـەڵات**
**چـــاوی ئاوات و هیـــوا ئەی گوڵی ســـەر تۆپی وڵات**
**دادەمرکـــێ کوڵـــی دڵ تاوێکی لێ خـــەم چ دەبێ؟**
**بـــە ســـەری نووکـــی زمانم لە بنـــی پەنجـــەی پات**
**ڕۆژی هەڵکەوتـــە دەســـا بـــێ دڵەکەم تێـــت ڕا کەم**
**بـــە ترۆمبێلـــی فیـــداکاری بـــەرەو کـــۆڕی خەبات**
**یـــاری شـــیرین دە وەرە تـــا زووە لێـــت نەچـــووە**
**تەمەنـــی جوانی بژیـــن پێکەوە تاکـــەی بەتەمات؟**
**گیانەکـــەم خـــۆ تـــۆ هـــەزار جاری تـــرت داوە بە من**
**قەولـــی بێ کـــردەوە هەر وشـــکەتریتم بـــە هیوات**
**کەنگـــێ بـــۆم دادەکەنی خۆمت بەســـەردا کێشـــم**
**کەوشەکەت ماچ کەم و سەر دانێمەوە بە رپێت کزومات**

لێــت نەچێ ڕەنگە لەبەر تەنگی، دەبا بۆت تەڕ کەم
دەســتە نــەرم و شــلەکەت بازنــە ئــازاری ئەدات
تونــد و تیژی بەســە، بۆم تێکــە هەتا لێــی ڕا دەم
بە سمێڵ گەسکی دەم ئەم تۆزە لەسەر شانی کەوات
تۆ لەســەر ئەم ڕقــە بیت تێــك دەچەقێیــن لە پڕا
تــۆ پێت دڕکــی مژۆڵ و مــن لە دڵ تیــری نیگات
هــەر نەبــێ تاقــە یەکێکم دەیــێ با خــۆم نەکوژم
لەو هەموو دەسڕەکە پێی دەسڕی دەم و لێوی نەبات
بێڵە خــاوی کەمەوە بــۆچ ڕەقە وا کەللەســەرت؟
بــاری لێــوم بــە تکــەی ئارەقەکــەی ســەرگۆنات
پــاش و پێش هەر یەکە بۆ من کە مەبەســتم چوونە
زەردەلیمــۆت بخەمە دەســتمەوە یا پرچی ســیات
هــەر لــەلای تۆیە ئەوی مــن دەمەوێ تێی کێشــم
خۆڵــی بەر پێتە لە چــاوم کــەوێ ڕووناکی ئەکات
حەز دەکەی جارێ بژیم بــۆم وەرە پێش تا تێی نێم
دەم لــە نێوانی مەم و ســینە، وە خۆم ئاوی حەیات
نایەڵــم بێشــێ وەرە پێشــێ دەبــا بــۆت تێ‌خــەم
ئەو دوو ئەنگوستیلەیی ئاڵتوونە لە قامکت بە خەڵات
دە وەرە گیان و قەوەت تاوێ ئەمەم بگرە بە دەست
نەبزی دەستم بە ســەری پەنجە نەخۆشم کە لەلات
من کە خــۆم ناوەتــە پێناوت ئەتۆش بــۆم فش کە
قۆڵی ڕاســتت بخەمە باســکم و دەرچیــن لە وڵات

**بـا بکـەم تۆبـە لەسـەر دەسـت و ئیتـر دایهێڵم**
**ڕیشـی بۆزم ببمە سـالیکی بەر کۆشـك و سەرات**
**هـەر وتـم کوانـێ؟ بڵـێ هانـێ، دڵم مەشـکێنە**
**«حافز»م موستەحەقم چاو لە دەسی تۆم هەموو کات**
**جوانی تۆی دا لە مەحەك ناحەزێ من بۆم دەرکەوت**
**ئـەوی جوانـان هەموو لایانـە بە تەنیـا هەیە لات**
**لێت ئەبـەم جارێ بەبێ دەنگ نەچـی بیکەیە قاو**
**نـاوی هـاوکاری لەگـەڵ شۆڕشـەکەی دیموکرات**

**١٠٤.** ئەم داستانە جێگای «وەڵامی بێ وەڵام»ـە، بەڵام لە مەعنادا بە ڕاستی «ڕشتەی مرواری»ـیە:

«مەولانا خالدی شارەزووری» لەلای «شاعەبدوڵڵای دیهلەوی» لە سەفەری هندوستان ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی کوردستان، هۆنراوەیەکی فارسی خۆی هەیە کە ئەڵێ:

**خالدا گر نیستی دیوانە و صحرا نورد**
**تو کجا و کابل و غزنین و خاك قندهار**

ئەم هۆنراوە بەرگوێـی «ماهشەرەف خانم»ـی کوردستانی ئەکەوێ. ئەو ماهشەرەف خانمە کە بە «مەستوورە» بەناوبانگە. لەبەر ئەم هۆنراوە دائیما ئارەزووی ئەوە ئەکا کە بە خزمەتی مەولانا بگات. جوانی مەستوورەش بەناوبانگ بووە.

مەولانا لە گەڕانەوەکەیا ڕێی ئەکەوێتە سنە. دەنگ بڵاو ئەبێتەوە لەناو شارا کە مەولانا خالد هاتووە. مەستوورەش ئەیەوێ ئەو ئاواتەی بێتە دی کە مەولانا ببینێ. یەکەم جار کوتوپڕ ڕۆژێك مەستوورە لەناو

کۆڵانا تووشی مەولانا ئەبێت، دەست ئەکا بە سەیرکردنی مەولانا، هەر لە تەوقەسەریەوە تا کەڵەمووستی پێ. مەولانا نایناسێ لەو هەموو سەیرکردنە شەرم ئەیگرێ؛ چونکە گۆشەی چاوی لێ ئەبێ کەوا ئەو بەو جۆرە سەیری ئەکا و چاوی لێ ناترووکێنێ ئەڵێ: ئافرەت! چاو داخەوە، سەیری زەوی بکە.

مەستوورە ئەڵێ:

من لە حەوا و تۆ لە ئادەم دەرچووین. حەوا ئەبێ سەیری ئادەم بکا، منیش سەیری تۆ ئەکەم. ئادەم لە خاك دروست بوو ئەبێ سەیری خاك بکا، کەواتە تۆ چاو داخە و سەیری زەوی بکە.

مەولانا لەو وەڵامە زۆر سەری سڕ ئەمێنێ و پاشان ئەیناسێ و پاش ئەوە مەستوورە ئەبێ بە جێگای «توجّه»ی مەولانا خالد و مەولانا ئەبێ بە شێخی مەستوورە.

١٠٥. پۆلە کچێك ئەچن بۆ ڕانەبێرە. بایزی کانەبی چاوی پێیان کەوت و پاشان گێڕایەوە بۆ دۆستەکانی بەم جۆرە وەسفی کردن وتی: وەکوو کارمامزی بەهارێ هەر لەرەیان لێوە دەهات.

١٠٦. باپیراغای پشدەری تووتنی هەبوو. ساڵح قەفتان ئەندامی لێژنە بوو، چووبوون بۆ پشدەر بۆ فەحس. باپیراغا زۆری خزمەت کردن بەو نیازە کە تووتنەکەی بۆ بکا بە شتێکی زۆر باش. پاشان ساڵح قەفتان بۆی کرد بە دەرەجەی دووەم. باپیراغا هەناسەیەکی هەڵکیشا و وتی: «پەکوو، وەڵڵا ئەفەندی لە پاشی نا».

١٠٧. فەقێ محەمەد هەمەوەند زۆر وەڕز بوو لە هەندێ کردەوەی مەحموودی کوڕی. هەڵیگرت بردیە لای مەلا حەسەنی قازی

شکاتی کرد وتی: جەنابی قازی ئەم کوڕەم زۆر بێدڵیم ئەکا. وتی: چۆن؟ وتی: قوربان عەرەق ئەخواتەوە و نوێژیش ناکا. مەحموو وتی: قوربان جەنابی قازی هەرچەندە بێعەدەبیشە، باوکمە، بەڵام قسەکەی وا نییە. فەقێ محەمەد وتی: جەنابی قازی ئەم کوڕە هەر وا لاسارە، قەت بووە نوێژ بەبێ خوێندنی قورعان؟

مەحموو وتی: قوربان قورعان ئەخوێنم و شتیشی لێ وەرئەگرم. مەلا حەسەن وتی: ئادەی شتێکم بۆ بڵێ با گوێم لێ بێ. ئەمجا مەحموو وتی:

شــەرابی ئاڵ و حــۆری چاوبەڵەك
پڕیەتی بەهەشت بە جۆگە و لەك لەك
بۆ تــام و ســەیرانی دڵ بــە ئاواتە
ئەم قســەی بەنــدە فتــوای باواتە

فەقێ محەمەدی باوکی وتی: قوربان ئەم نەگبەتە دوێنێ چووە قورعانەکەی مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵی دزیوە و ئەم شتانەی لێوە فێر بووە. مەلا حەسەنیش وتی: سا بەخوا منیش شتێکیترم لە قورعان وەرگرتووە با تەواوی کەم بۆی:

جــەزای پیاوی چــاك ئــەو حۆرییانەن
مەستی بادەی مەی ئەو ساق سیمانەن

بڕۆن بڕۆن قورعان ئەزانن و عەمەلیشی پێ ناکەن بەڵام لە چارەتان دا.

٨٠١. «امین السّادات» هەبوو لە سەیدەکانی «باینچۆ» و سنە بوو. زەمان هێنابووی بەسەریا هەژار کەوتبوو. خۆیشی بە تەواوی تەرکی دنیای کردبوو، کەوتبووە خانەقای بیارە. چووەکانیشی نەمابوون.

پیاوێکی گردە پیاو و کورتەباڵا بوو، قسە نەستەق و بە دانە دانە قسەی ئەکرد.

ڕۆژێـك «جافرسـان» ئەچێتـە بیـارە، لـەلای «شـێخ عەلائەددیـن» دانیشتبوو، «امین السّادات»یش لە گۆشەیەکی حەوشەکەدا دانیشتبوو، چەنـد کەسـێکی لـێ کـۆ بووبوونـەوە قسـەی بـۆ ئەکـردن؛ خەڵکەکەش حەزیان ئەکرد گوێ لە قسەی بگرن.

جافرسانیش لە دوورەوە گوێی لە قسەکانی ئەبوو، وا دیار بوو قسەکانی تۆزێ لەشی جافرسانی ئەخوراند. ڕووی کردە شێخ عەلائەددین وتی: شێخ عەلائەددین ئەم سلوسواڵکەرانە چین کە کەوتوونەتە ئەم خانەقایە؟ کەس نازانێ ئەسڵوفەسڵیان چییە و کوڕی کێن، خۆیان کردووە بە پیاوماقووڵ. مەبەستیشی «امین السادات» بوو.

لـەو کاتـەدا بانگـی نیـوەڕۆ بـوو، بانگیش گەیشتە «أشـهَد أن محمّداً رسولُ الله». ئەمینوسـاداتیش گوێی لە قسـەکانی جافرسان بوو، هەستا داردەستەکەی دەستی هەڵگرت و هات بەلای جافرسانەوە وتی:

«ئاغەی جافرسان! ئا ئەوە لەو بانگەدا هەیە باوای من بوو یا هین تۆ؟ ئێمەگەل بێ ئەسڵوفەسڵ نین، ئێوەگەل کەس نازانێ لە کوێنەوە هاتگن! بـە کەڵەگایـی سـواری ئەم وڵاتە بووگن. ئێمە هەزار ساڵە لەم وڵاتەین و کوردیچین. وەلێ ئێوە بەبێ فەسڵی هاتگن و کوردیچ نین. خانەقای بیارە جێگای نەجیبزادەگەلـە، جێـگای بێ ئەسڵوفەسـڵگەل نییە. بەم دارە ئەو دەم و لەوسەت ورد بکەم؟! ناوێ بزانی چۆن قسە ئەکەی؟».

جافرسان هەروا لە شوێنەکەی خۆیا تەرێق بووەوە، بەڵام نەیخستە خۆی، گوایە لەبەر شێخ عەلائەددین و خانەقای بیارە دەنگ ناکا.

**١٠٩.** «گەڵباغی»ـیەکان وەختی خۆی تاڵان و ڕێگرییان ئەکرد. ترسیان چووبووە دڵی خەڵکەوە. دنیاش ئاسایشی نەبوو، هەرکە بۆ خۆی بوو؛ لەبەر ئەوە بێکارە و مێکارەش ئەچوون ڕێگرییان ئەکرد. بەڵام گەڵباغییەکان ترسێکی وایان بردبووە دڵی خەڵکەوە، هەرکەسە ڕێگری بکردایە عالەمەکە هەموو بە گەڵباغییان ئەزانی و زوو خۆیان ئەدا بە دەستەوە.

ڕۆژێك ژن و پیاوێکی «مارنج»ـی ڕێیان ئەکەوێتە ئەو وڵاتە، دەستەیەکی ڕێگر بەناوی گەڵباغییەوە ڕێیان پێ ئەگرن. کابرا تفەنگێکی پێ ئەبێ، تفەنگێکیان تێ ئەگرێ. ڕێگرەکان هەندێ دوور ئەکەونەوە ڕێگەکە بەرەڵا ئەکەن، پاشان ئەگەڕێنەوە. کابرا تفەنگێکی تریان تێ ئەگرێ فیشەك دەرناچێ. لەوە زیاتریش فیشەکی پێ نییە، ڕێگرەکان ئەزانن فیشەکی پێ نەماوە گەمارۆیان ئەدەن. ژن و پیاو لەیەك دائەبڕن، ژنە ئەگرن و پیاوەکە هەڵدێت. بە ژنەکە ئەڵێن: ڕووتەوە بە چیت پێیە داینێ و بڕۆ. ژنە ئەڵێ:

من یەك تاکە ئەشرەفیم پێیە، ئەوە تاکە ئەشرەفییەکە؛ بەڵام پیاوەکەم هەموو ئەشرەفییەکانی منی خستۆتە گیرفانی، ئەوا لە دەستتان چوو. حەز ئەکەن ناونیشانیشتان ئەدەمێ کە لە گیرفانی لای ڕاستیایە.

تومەس ئەمە وەختی خۆی کە لە ماڵ دەرچوون، چەند فیشەکێك لە ماڵا بوو، ژنە هەڵیگرتبوو خستوویەتە گیرفانی لای ڕاستی مێردەکەیەوە.

جەردەکان کە ئەمە ئەزانن هەڕا ئەکەن بەشوێن کابرادا. لێی دوور ئەبن، ئەو هەڕا ئەکا ئەمان هەڕا ئەکەن. لێی نزیك ئەکەونەوە بە جۆرێکی وا کە دەنگیان ئەیگاتێ؛ بانگی لێ ئەکەن: کابرا، ئەو ئەشرەفیانەی کە لە گیرفانی ڕاستتایە داینێ و خۆت بڕۆ؛ ئەوا ژنەکەشت بەرەڵا ئەکەین،

ژنی خۆیشت بەرەوە.

کابرا لەم قسەیە زۆر سەری سڕ ئەمێنێ، ئەشرەفی چی و شتی چی؟ کەی ئەم ئەشرەفی پێیە؟ جەردەکان لێی نزیك ئەکەونەوە و هەر هاواریش ئەکەن؛ وەکوو بڵێیت کابرا خۆیشی ئەکەوێتە شکەوە. دەست ئەکا بە گیرفانیا هەر بەدەم ڕاکردنەوە، کەچی فیشەك دێ بە دەستیەوە. فیشەك دەردێنێ ئەیخاتە سەر تفەنگ، لا ئەکاتەوە تفەنگیان تێ ئەگرێ. ڕێگرەکان ئەسەڵمێنەوە، تفەنگێکی تریان تێ ئەگرێ ئەڵێ: ڕاوەستن. لەولاشەوە ژنەکەی دێت، تفەنگی سێیەمیان تێ‌ئەگرێ، ئەڵێ: دەست بەرزەوە کەن و ڕووتەوە بن. لوولەی تفەنگەکەیان تێ‌ئەگرێ و دەستی لە کارایە. ژنە دێت ئەڵێ: جارێ بێنن ئەشرەفییەکەی خۆم، پاش ئەوە لووس و باریك چییان پێ ئەبێ لێیان وەرئەگرێ و ئەڵێ: بڕۆن. بانگ ئەکەن لە کابرا ئەڵێن: بڕۆین؟ ئەڵێ: بڕۆن. پیاوە دێت ناوچەوانی ژنەکەی خۆی ماچ ئەکا و ئەمانیش ئیتر بەبێ ترس ئەڕۆن.

.١١٠ مەلا مارفی کۆکی لە سابڵاخ و لە وڵاتی موکریان ژیانی بە ناسۆری بەسەر برد. لە سەردەمی دواییدا یەکە هۆنەری موکریان بوو؛ بەڵام ڕۆژگار ڕۆژبەڕۆژ زیاتر پشتی تێ‌هەڵئەکرد. سەرەتای دەروازەی ناسۆری بێ‌پایانی، کوشتنی کوڕە گەنجەکەی (مەلا عەلی) بوو. ئەم کوڕە لە سەردەمی پاشایەتی ڕەزاشادا وڵاتی موکریانی شڵەژاندبوو، ئاگرێکی قودرەت بوو پەیدا بووبوو. مەلا عەلی ڕیوەڵەیەك بوو، بەڵام چارەنووس هێنای بەسەریا کەوتە کەژ و شاخ و پیاو کوشتن.

ئاغەواتی موکریان و حوکوومەتی ئەو وڵاتەی ڕەزاشای ئەو دەمە، بەڕاستی لە ترسی مەلا عەلی خەویان لێ نەئەکەوت. بە جۆرێ

سامی پەیدا کردبوو منالێ لە بێشکەدا کە ئەیانوت: مەلا عەلی هات؛ ژێر ئەبووە و لە ئەنجاما مەلا عەلی کوژرا. ئەم کوژرانەی ئەو بوو بە کردنەوەی یەکەم قاپی مەینەت و گریان و زاری بۆ مەلا مارفی کۆکی. بەرەبەرە هەتا ئەهات مەلا مارف بەلای پیرییەوە ئەڕۆیشت و بەلای جیا بوونەوە لە دۆستانی دێرینەیەوە ئەڕۆیشت. گریان و زاری هەر زیادی ئەکرد، چاوی ڕووناك، لەبەر گریان تەکانی ئەدا بۆلای نابینایی.

خەڵکوخوا ئامۆژگارییان ئەکرد: کە بەم گریانە چاوی خۆیشت دائەنی، بەڵکوو داشت ناوە؛ ئیتر واز بێنە. با ئەو چوار ڕۆژە ژیانە کە ماوتە بە ڕووناکی دنیا ببینی. ئەویش لە وەراما بەم دوو هۆنراوە جوابی دانەوە:

**ژیــان ئەولاد، ژیان ئەحباب، ژیــان ئەییامی جوانی بوو**
**نەمــا ئــەولاد، نەما ئەحبــاب، نەمــا ڕۆژانــی ڕابردوو**
**چ دێ ئیتــر دەبینم مــن بە ئەو چاوەی کــە جاران بوو**
**نەمێنێ با ئەوەش ڕەببی کە ئەو دەستەی لە دەس دەرچوو**

**١١١.** ئەحمەد عەزیزاغا بۆی گێڕامەوە وتی: ڕۆژێك ئەوا لە جادەکەی مەڵکەندییەوە سەرەوخوار ئەبووینەوە بۆ بەر «دەرکی سەرا» و دووکانەکەی حەمەسەعی خەیات. کوڕێکی جوانکەلە لە پێشمانەوە بوو، لەبەر خۆیەوە ئەم شیعرەی ئەخوێندەوە:

**لە دەشتی میحنەتا من کەوتبووم ئێمشەو بە بێهۆشی**
**خــوا تاکەی بە بێگۆشــی خــوا تاکەی بە بێنۆشــی**

قوتبەدین هەڵیدایە وتی:

دەك بە ملی شکاو و ئەستۆی وردم، ئەوە من لەکوێ بووم ئێمشەو؟!

۱۱۲. حاجی ئەحمەد هەبوو لە سولەیمانی؛ کەڵکی نییە، تا نەڵێین ئەحەڕەش کەس نایناسێ. ئەم حاجی ئەحمەدە پیاوێکی نەخوێندەوار و قسەنەستەق بوو؛ قسەکانی بە دانسقە ئەشیان. یەکێ لە قسەکانی ئەوەیە ئەیهێنا بە باوەڕی خۆی پیاوی ئەکرد بە چوار بەشەوە ئەیوت:

هەیە پیاوی کوڕی پیاوە، هەیە پیاوی کوڕی سەگە، هەیە سەگی کوڕی پیاوە، هەیە سەگی کوڕ سەگە.

(لە زمانی کوردیدا گەلێ جار پیاو ژنیش ئەگرێتەوە؛ ئەم وشەیە بەرانبەر بە ئینسانە).

۱۱۳. هەتا پارە سەری لە عالەم تێك نەدابوو، مەلاکان کە دائەنیشتن، کۆڕی ئەدەبی ئەوان دەنگی دابووەوە.

جارێك لە سنە شێخ ئیمامی خەتیبی مزگەوتی «دارالإحسان» زیافەتێکی نان‌خواردن ئەکا بۆ شێخ «حبیب‌الله»ی کاشتەری و مەلا محەمەدی ئەویهەنگی. لە پاش دانیشتن نان دێت؛ نانێکی باش. لە سەری نانەکەدا ماسییەکیش دائەنێن. لە کاتی دانانی نانەکەدا شێخ حەبیبوڵڵا و مەلا محەمەد چاویان لێ ئەبێ ماسییەکی گەورەتر لەناو سینییەکا «ئەولێ» پیاوی شێخ‌ئیمام ئەیەوێ بیهێنێ بۆ ژووری نانخوارنەکە، کەچی نایهێنێ و ئەیگێڕێتەوە. ئیتر نەهێنانەکەی لەبەر چی بووە، ئەوە ئەولێ خۆی ئەیزانێ.

دەست ئەکەن بە نانخواردن و سەرە دێتە سەر ماسی. شێخ حەبیبوڵڵا بە مەلا محەمەد ئەڵێ: ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ﴾. ئەرێ ئاغای مەلا محەمەد، بەڕاست ئەو کارەساتی یوونسی پێغەمبەر و ماسییە چۆن بووە؟ ئەویش ئەڵێ: ئاغەی شێخ حەبیبوڵڵا

ئەو کارەساتە لە کتێبی تەفسیردا هەیە، لەگەڵ ئەوەشا با هەر لەم ماسییە بپرسین باشترە. سەر ئەبا بە لای ماسییەکەوە، گوێ ئەنێ بە لای دەمیەوە و پاشان سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێ: «ئاغەی شێخ حبیبوڵڵا لێم پرسی وتی: ئەو زەمانە من بچووك بووم، وەلێ ماسییەکی گەورەتر هەس کە ئەولێ بردیەوە، لەو بپرسە ئەو گشت خەوەرێکی لا هەس و پێت ئەیژێت.

شێخ ئیمام و ئەوان دەست ئەکەن بە پێکەنین و ئەڵێ: ئەولێ ئەمە چی بوو گێڕات؟.

.١١٤ مەحمووپاشا جارێك زۆری برسی ئەبێ، دوێنەی بە دۆکوڵیوەوە بۆ دێنن ئەیخوا. لەبەر ئەوە زۆری برسی ئەبێ، زۆری لێ ئەخوا و بەلایەوە بەلەزەت ئەبێ.

پیاوێکی ئەبێ قادری سانەحمەدی برای حەمەی ناو ئەبێ، بەلایەوە ڕاوەستاوە، مەحمووپاشا بەدەم خواردنەکەوە هەر باسی خۆشی دوێنە بە دۆکوڵیوەوە ئەکات. قادریش بۆی دائەنیشێ و ئەڵێ: «میرم! دوێنە وە دۆکوڵیوەوە کەسێ نەیخوا قەدری نازانێ، مەگەر میرێکی وەکوو تۆ بزانێ خوا چ تەحامێکی دروست کردگە. ئەو سێ پەری مێگەلیماڵی پاشا کە ئەچێتە سەر «ئاوێسە» و ئاو ئەخواتەوە و شیر ئەدا و کاوێژ ئەکا، ئێژی شەراوە هۆڕی بەهەشتە، ئەیکەن وە ماس و دوایی وە دۆ، گەنمی قەنەهاری وڵات ئەکوڵێنن و لە تەکیا گرتکی ئەکەن، وەکوو گوڵەڕێواسی کوێستانی لێ تێ. کە وشك ئەوێتەوە ئێژی تۆپەڵە نەواتی شاری سنەس. کەشکە زوردەکەی ماڵی میمکە هامینەی ئەکرێتە وەر، کە ئەینی وە سەرەوە وە قەورەکەی حەمەپاشا وە بێ دگان فرتە ئەکاتە ناو هورگەوە، وە دوعای «باڵانتەران» وێ. ئەوێ وە خواردنی گشت مێرپاشایەك، نە تۆڵترمە بۆی

ئەوێسێ نە فڕفڕینێ.

**دۆکوڵیوی شای گشت سەرسینی قەنـد و نـەوات و دارچینـی**
**ئێژی بەهەشـت ناردگیەسـی هەتا بیخۆی هەر هەی برسـی**

مەحمووپاشا وا دیار بوو زۆری لێ خواردبوو تەبێعەتی پێ تێك چووبوو، وتی: وەڵڵا کوڕی سانەحمەد لام وایە دوێنە وە دۆکوڵیوەوە وە نەوێ شتێکی فرەخاس وێ. کوڕی سانەحمەدیش ئەڵێ: «میرم! ئەو دوێنە بێفەڕە هێشتا نەتکولاندگە ئێژی کوچکی هەوارەلێژەی بانی خێلانە، کە دگانی پیا ئەنی وەکوو جۆی ژێـر دگانی کەر قرمەی لێوە دێت. خۆ ئەیخەیتە سەر سێ کوچکە ئەوێ وە هەویری ماڵە دۆمەکانی سەی‌ساق. ئەو گەنمە قەنەهارییـە جوانەی دەشتی گەرمیانـە ئەکەیتـە ناوی ئەیماشێتەوە و ئەیماسێنێ وەکوو کزنە ڕەشە خوانەناسەکەی مەریوانی لێ تێ. کەوچکی لێ دائەگری لەبەر بڵێسـەی غەزەوی تیا ناوێسـێ، ئێژی باوکە کوشتەی یەکن، خوا بکا وە نەسیوی دوژمنیشت نەوێ پاشا. ئەویش ناوی خۆی نیاگە خواردن دەی بێفەڕ دۆکوڵیوە دوێنە.

**دۆ کوڵیـوە ترشـە پیسـەکە هـەر دۆخـەواس لە کیسـەکە**
**خۆی لێ کردگین وە پیاوماقووڵ ئێژی تەرسـە و لـە بانی تووڵ**

مەحموو پاشا ئەڵێ: خوا بتگرێ قادر تۆ هەر ئێستە نەهاتی بە سەروبالای دوێنـە و دۆکوڵیـوەوە و مەدحـت ئەکـرد؟ ئێسـتە ئەمـە چی بـوو هاتی وە سـەروگوێلاکیا و دەسـتت کرد وە زەم کردنی؟ ئەویش ئەڵێ: «میرم من پیاوی تۆم، پیاوی دوێنە وە دۆکوڵیوەوە نیم، ئەوێ شتی بێژم کە تۆ پێت خۆش وێ نەك دوێنە وە دۆکوڵیوەوە».

١١٥. لە کۆڕێکی بەزمی تاجرانەدا کە سەرخۆشانی بادەی شەراب دنیایەکی‌تریان دروست کردبوو، شەرابی ئەرغەوانی و کۆڕی نەخجەوانی دڵی دڵدارانی ئەهێنایە سەمای سولەیمانی. نەونەهاڵێکی باغی جوانی بە دەسرۆکی ئاوریشمی غەمزەی غەزەڵخوانی ئەهات و ئەچوو سەمای ئەکرد و هەڵئەچوو، سمتی خڕی لە گۆ ئەچوو، مزراح ئامێز ئەخولایەوە، دڵی دڵدار ئەکولایەوە. یەکێك لە کۆڕەکەدا دیار بوو مەیلی نە لە شەراب بوو نە بە ڕەباب بوو، بەڵکوو چاوی لەو سمتە خڕە بوو، هۆشی لەلای ئەو خرتە بوو. کوڕەکە هەستی کرد و لایەکی بۆ کردەوە وتی:

چاوت نەبێ لەم کوندە وا دێت و دەسووڕێ
ئاشـێکە بـە خوێنی دڵی سـەییادە گەڕانی

١١٦. لە ساڵی (١٩٢٧ ـ ١٩٢٨)دا شێخ مەحموودی حەفید لە دێی «پیران» بوو. کچێك لە دێی «دۆڵەسوور» بوو لە نزیکی پێنجوێنەوە. کچە «مینا»ی ناو بوو؛ مینا ڕاست بوو کە شووشە بوو. هەر لە دێی دۆڵەسوور جێگایەك هەیە «کانی گەرمی بەرماڵان»ی پێ ئەڵێن. شێخ ئەیویست لەو تەمەنی ٤٦ ـ ٤٧ ساڵەیەدا مینای ڕەنگ مینا بهێنێ. میناش لەو سەردەمەدا لە تەمەنی ١٨ ساڵانا بوو.

مەلا «کاکە حەمەی بێلوو» ئەم خەبەرەی بیست، ئەم دوو شیعرەی خوارەوەی نارد بۆ شێخ مەحموود. شێخ ئیتر وازی لە فیکرەکەی هێنا:

زەرفی مینا، شاهی من! مەزرووفی ئەڵماسی ئەوێ
هەروەکـوو ماکینـە دەرزیی تیژ و ڕەققاسـی ئەوێ
قەتعی ڕێگەی دۆڵەسـوور و کانـی گەرمی بەرملان
غیرەتـی چابـوك سـواری قەومـی بڵباسـی ئەوێ

١١٧. قسە لە شت گرانییەوە ئەکرا، «بێخود»ـی شاعیر وتی: باوکم گۆشتی ئەمین چیتر ڕۆژی شەنبە بۆ منالان لە هەموو شت گرانترە.

١١٨. یەکێك لە دۆستان ئەمەی لای خوارەوەی بۆ گێڕامەوە وتی: ئەوا دەشتێکە لە وڵاتی «سایەنقەڵا»، شەونمی بەهار ڕازاندوویەتەوە، گوڵ و گوڵزارە، ڕەیحانە و وەنەوشە دەستیان لە ملی یەك ئاڵاندووە. خەرمانەی گوڵ و خەرمانەی مانگ چاوشارکێ ئەکەن لەو بەهەشتەدا و لەو دەشتەدا. تاقەگۆڕێکی لێیە، وا دیار بوو دڵی دڵدارانی ئەکولاندەوە؛ دڵی ئەکولاندووەوە بە چی؟ بە خامۆشییەکەی. بە خامۆشی ئەو کەسە کە لە دوو توێیدا سەری ناوەتەوە و دڵی کردۆتەوە بۆ نەوای نازداران و بۆ دەنگی خەرامانان. وتی: لەسەر ئەو گۆڕە پەرییەك بوو، باوەشی پیا کردبوو، وەکوو بارانی بەهار فرمێسك بە چاویا ئەهاتە خوارەوە و وەکوو کۆتری یاهوو ئەیلاواندەوە؛ نەك دڵی هەر ئەو کەسە کە لە گۆڕەکەدا بوو، بەڵکوو دڵی بەردیشی ئەتواندەوە.

چووم بەلایەوە هەستم بۆ ڕاگرت، وەکوو ئەو هەستەی کە بۆ سرووش ڕائەگیرێ. چۆن دەنگی بەسۆز لە کەمان و پیانۆی بەسۆزەوە ئەزرنگێتەوە، ئەویش لە گوێدا ئەلەرێتەوە. وتم: ئەی پەری بۆچ وا ئەگری؟ ئەی دڵ بریندار بۆچ ئەوەندەی‌تر دڵی دەروونی ئەو خاکە بریندار ئەکەی؟ ڕاچەنی، دڵمی تەنی. سەیرم کرد ڕوومەتی ئەو لەناو قژە شەوەییەکەیدا دەرکەوت! ناتوانم بڵێم مانگی چواردە بوو لەناو پەڵە هەورە ڕەشەکانی ئاسماندا کە سەری ئەهێنایە دەرەوە؛ چونکە ئەو مرواری فرمێسك لەناو دوو چاویا کە ئەهاتە خوارەوە بە ڕوومەتیا برقەی زێوینی لە بریقەی گوڵاوی ناو شووشەی بەر هەتاوی ئەکرد!. مانگی ناو پەڵە هەوری ئاسمان ئەوەی تێدا نەبوو.

وتم: ئەو کوڵەت ئەگەر بۆ دۆستتە لە جێگای ئەو نیشان بگرە لەم دۆستە کە دەستی لەبەر دەستتە، بەهاری جوانی لە خەزانی پیری داوا مەکە. تەمەن کە ڕابورد کەمەندی خەیاڵ نایهێنێتەوە. پڕمەی گریان بکە بە دەنگی شادی، ئاوازی زاری بکە بە نەوای گۆرانی. لە باخێکیترا ببە بە گوڵی بولبولێکیتر. کە ئەمانەم وت، سەیرێکی کردم و بە هەنسکی گریانەوە وتی، بەڵام وەکوو شەکر لە لێواری یاقووت و سەدەف بباریّ:

مـــن و ئەم گوڵـــەی کەوتۆتە ناو خاك
بۆ مـــن دڵێك بوو نەیبوو لەکەس باك
منیش گوڵێك بووم لـــە دنیای ئەودا
هـــەوار بـــە هەوار لـــە ڕۆژ و شـــەودا
ئەگەرا سەرســـام بە دەشـــت و دەردا
بـــۆی دانام ڕۆحی لە گـــۆڕی تەنگدا
من و ئەو گوڵ و بولبول بووین لە باخ
جاریّ ئەو گوڵ بـــوو بەوێنەی چراخ
جاریّ بولبـــول بوو لـــە دەورانی من
ئەیخوێنـــد بە بـــاڵای نەونەمامی من
من جاریّ مۆم بووم ئەو پەروانە بوو
جـــاریّ ئەو مۆمـــی مـــن پەروانەبوو
ئێســـتە خاك کەوتە بەینـــی من و ئەو
دنیـــای ڕووناکـــی لیّ کردم بە شـــەو
حەیفـــە ئەو بـــاڵای کـــە دیومە لەلام
جێـــی بگرێتـــەوە بێگانەیکـــی خام

**بە خوڕەی فرمێسك ئەم خاكە ئەدڕم**
**ئەچمە لایەوە گشـت ئـاوات ئەبڕم**
**سـەر بەرزۆ ناكـەم تا ئەچمـە پاڵی**
**گوڵەچـن ئەكـەم لە خـەت و خاڵی**

وتی: بێدەنگ بوو. كە چوومە سەروەختیەوە گیانی سپاردبوو. چووم چەند ژن و پیاوێكم هێنا. ژنەكان شتیان و پیاوەكان لە تەنیشت گۆڕەكەی ترەوە گۆڕێكیشیان بۆ ئەو هەڵكەند، ئەسپەردەی خاكمان كرد، لەوێدا بەبێ جیابوونەوە بە ئەبەدی دەستیان كردە ملی یەك.

**١١٩.** ئەزانی ئەم هۆنراوەی مەولەوییە چەند مەعنای هەیە؟

**دیدەم ڕێژاوەن ڕوخسارم زەردەن    جە دووری یاران پیرانم كەردەن**

پێش هەموو شتێك بزانە كە «ڕێژاو، زەردە، یاران، پیران» ناوی شوێنن.

**١٢٠.** شێخ محەمەدی گوڵانی لە مزگەوتی قامیشەكان بوو لە سولەیمانی. مزگەوتەكە تۆزێ دەستكاری ئەویست. ئەو سەردەمە مزگەوتەكان ئەهلی گەڕەك هەموو ئەركەكەیان ئەخستە سەر شان. ویستیان پارە كۆ بكەنەوە بۆ ئەو تەعمیراتە، پیاوێكی پیری دەوڵەمەند هەبوو لە گەڕەكەكەدا «مچەدیزە»یان پێ ئەوت. شێخ محەمەد و دەستەكە ڕوویان نا لە مەلا سمایلی كانیسكان كە بچێتە لای مچەدیزە داوای شتێكی لێ بكا بۆ ئەوە ئەویش بەشدار بێ لە چاككردنەوەی مزگەوتەكەدا.

وا دیارە ئەو مچەیەش بەرگدروو بوو. مەلا سمایل وتی: ناچم؛ بۆلای هەركەسێكی‌ترم ئەنێرن ئەچم، بەڵام بۆلای مچە ناچم. وتیان: بۆچ ناچی؟ وتی: كوڕە ئەیناسم، هیچی لە دەست نابێتەوە. وتیان: وا نییە، بۆ ئەم جۆرە شتانە زۆر دڵ و دەروونی باشە. وتی: «كوڕە ئەوە ئێوە ئەڵێن چی؟

وەڵڵا ئەگەر مچە پڕ بە ژوورێك دەرزی هەبێ، یەعقووبی پێغەمبەر هەموو پێغەمبەرەکان بکا بە تکاکار، مەلایەکەتەکان هەموو بێنێ بیانکا بە کەفیل بۆ ئەوە دەرزییەکی بداتێ بە ئەمانەت بۆ دروونەوەی کراسەکەی یۆسفی کوڕی، کە زولەیخا لە دواوە دڕیبووی، نایداتێ! ئێستە چۆن پارە ئەدا بە من کە مزگەوتی قامیشەکانی پێ چاك بکرێتەوە؟ بەخوا نارۆم ئەگەر هەزار هاوار بکەن».

.١٢١ حەسەن بەگی جاف ئەیوت: یەکێ لە کۆڕی سەرخۆشانا دابنیشێ و ئەو نەخواتەوە، وەکوو زیندوویەك وایە لەناو مردوواندا بێ؛ لە مەزەکەیان ئەخوا، گاڵتە بە ئەقڵیان ئەکا!.

.١٢٢ ئاغایەکی شەرەفبەیانی کارەکەرێکیان لەماڵا ئەبێت. ڕۆژێك ئەم کارەکەرە نان بۆ ئاغا دێنێت، کەڵەشێرێکی سوورەو کراوە بەسەر برنجەکەوە ئەبێ، بەڵام نە سەرەکەی لەگەڵایە نە قاچەکانی.

ئاغا سا یا لەبەر ڕەزیلی ئەبێ یا لەبەر زمانپاراوی ئەڵێ: کوا سەر و قاچەکانی؟ ئەڵێ: ئاغا فڕێم دان. ئەڵێ: قاچەکانی بۆ تۆ، بەڵام سەری چۆن فڕێ ئەدەی؟ ئەگەر سەر نەبێ لاشە هیچ نییە، سەر ئەو سەرەیە کە لەشکر بەووە ڕائەوەستێ. سەر بۆ کەڵەشێر وەکوو شایە بۆ کەڵەمێر. ئەو سەرەی کە تۆ بە هیچی ئەزانی، جێگای بیرکردنەوەی عاشقان و ناوداران و پاڵەوانانە. سەر لە سەرەوەیە بۆیە وا هەموو دەم لە بەرەوەیە. خۆ سەری کەڵەشێر هەر قسەی لێوە ناکرێ. ئەو دەنگە و ئاوازەیە کە لەو دەرئەچێ، ماڵ بە ئاگا دێنێ، دز ئەڕەتێنێ، نوێژی بەیانی ئەهێنێ، دەنگی عەرش ئەجووڵێنێ، چاوت لێ نییە لە چاوی، کە ئەو ئەکەن بە وێنە بۆ شەرابی بێ وێنە. ئەو چاوە جوانەی کە ئەیتروکێنێ وەك ئەستێرەیەك

کە ئەجریوێنێ؛ کەسێ گورچیلەی بێتە دەرد و ژان، خواردنی مێشکی ئەو بۆی دێنێ دەرمان. خرپەی ددان لەبەر خرێنچکەی سەری ئەڵێی ڕیواسە لە تۆی دوودەری. دە هەستە بچۆ بێنە، دەست وە سکتا مەهێنە، دنیا کە سەری کەڵەشێر و چاوی کەڵەشێر و مێشکی کەڵەشێری تێدا نەبێ، وەکوو ئەو سەرایەیە کە شەرابی عەقیقی بیری حەقیقی و تریاقی عێراقی تێدا نەبێ. بە باڵ بڕۆ وەکوو داڵ بڕۆ خەمی بخۆ خۆت لێی مەخۆ، بۆم بێنە زوو، ئەتدەم بە شوو تەنکە ماڵت ئەبێ، دەردت نابێ، کوڕت ئەبێ، کچت نابێ.

کارەکەرەکەش وتی: بەڵێ ئاغە، دونیا بەداخە! بۆ ئەو کەڵەشێرە کە فەرمووی، ڕاستە سەر، سەرە؛ بیری عاشقان و ناوی ناوداران و جەرگی پاڵەوانان لە دڵایە، نەك لە سەرایە. دەنگی کەڵەشێر هەبێ و نەبێ ڕۆژ هەر ئەبێتەوە، دەنگی مناڵ بۆ ماڵ گەلێك بەتینترە بۆ ڕەتانی دز و بۆ هەژانی دەنگی مەلایەکی عەرش، چاوی وەختێ وێنەیە کە وریا بێ، کە لێکی نا! بەڵێ: چاوی جوانە، بەڵام وەختێ جوانە کە کێردی ستەمی نەگاتێ. کە کێردی گەیشتێ لە باتی جوانی فرمێسکی تیا قەتیز ئەبێ. ڕەوایە بۆ گورچیلەیەك ئەو مێشکە بڕوا کە هەزار ئاواتی تێدایە؟

ئاغەم! خرێنچکە سەری ددان ئەڕزێنێ، ڕیواسی دەری بۆ کەوی دەری با ئەو بیهێنێ بۆ ناو دوودەری. شەرابی عەقیقی و بیری تریاقی عێراقی لە دونیای سەروچاو و مێشکی تەنگی کەڵەشێردا جێی نابێتەوە. خۆزگەی بە دوێنێ ئەو کەڵەشێرە، ناجووڵێ ئیمڕۆ کەوتووە لێرە.

ئاغەم! بە باڵ ئەڕۆم، وەك داڵ ئەڕۆم، ئەمدەی بە شوو، ئەمکەی ڕەدوو، کوڕم ئەبێ، کچم نابێ، کەیفی تۆیە با هەر وابێ. ئەو جوانەمەرگەی چاوی نووستووە، لاشەکەی لێرە ئەوا کەوتووە. سەر لە شاری خامۆشان،

کەوتووە لەناو بێ هۆشان.

**نە سـەر هەیە و نە قاچی ڕەش نە ڕەنگ هەیە نە دەنگی خۆش**

ئاغە وتی: ئەترسم فڕێت دابێتەوە ناو سك. کارەکەرەکەش وتی:

**ئەو سـکە کەوا ئەوەی تیا نەبێ یاخوا هەر نەبێ یاخوا هەر نەبێ**

**١٢٣.** ژنێکی خەڵکی شارباژێڕ منداڵێکی هەبوو، ئەیدا بە دەستا و هەڵیئەپەڕاند؛ بە دەمیەوە پێ ئەکەنی و ئەمانەی لای خوارەوەی هەڵئەدا و ئەیوت:

**مـاڵی بـاوکت ئاوایـە نـەری چـاوم ئاوایـە**
**نایـدەم بـە ملکـی دنیا ئـەم کۆرپەیەم بـە تەنیا**
**گەورەی ئەکەم بە دەستم ئەیکەم بە مایەی دەستم**
**ئەیکـەم بـە پاڵەوانـێ کـەس نەتوانـێ بیڕوانێ**
**لـە جـوانیدا چـرایە شـەوقی لێمـان بەردایە**
**یووسـف کە بـێ بیبینێ دڵـی بـە خـۆی دەمێنێ**
**ئـەو کچانـەی لە شـارن وەك ئەسـتێرە دیـارن**
**هـەرا ئەکەن بە دەسـتە بۆی دێنن گوڵ بە بەسـتە**
**پۆلـی کچـانی لادێ کـە دێنـەوە لـە لادێ**
**ئـەو نێرگس و وەنەوشـە کە بـۆی دێنن بە کۆشـە**
**ئەیبارێنـن بـە سـەریا وەك ئـاوی مەندی دەریا**
**ئەویـان ئەڵـێ هـی منە ئەمیـان ئەڵـێ بـۆ منـە**
**ئەمانە گشـت بەم جۆرە بۆی شـێت ئەبن بە نۆرە**
**ئـەم کۆرپەیـەم نەمامـە هەم کۆرپـە هـەم برامە**
**خوایە عومری درێژ کەی چاوی بەدی لێ دوور کەی**

◈◇◈

# پیری و جوانی

١٢٤. کوڕێکی لاوی شۆخوشەنگ کە تازە پێی نابووە بەهاری جوانی، لەگەڵ پیاوێکی پیری نوورانی کە لە خەزانی پیریدا سەرەتاتکێی بوو، بۆ ئەوپەڕی ئەو خەزانە کەوتنە وتوویرە. کوڕەکە هات بە باڵای خۆی و جوانیدا وتی:

بابە! ڕۆژانی جوانی، ئەو ڕۆژە کە ئێستە منی تێدام، بەهارێکە کە هەر دەمارێك لە وازێك و هەر ڕەگێك لە سازێك لێ ئەدا. ئەو ڕۆژانەی کە بەسەر منا دێت لەبەر ئەو هێزی جوانییەم، نە لە لافاوی بەخوڕ ئەپرنگێمەوە، وە نە لە تۆفی سەرمای بەگوڕ ئەسڵەمێمەوە. شەوانی ئەو جوانییە ڕۆژانی کامەرانییە. بە ڕۆژ لەگەڵ گوڵەندامانداا ژوان ئەگرم، بە شەو لەگەڵ دڵدارانداا دەستلەملان ئەبم. بە لووتەلاوە ئەچم بەلایانەوە، ئەوان بە غەمزە و نازی مەستانەوە دێن بەلامەوە.

ترس وەکوو هەرەس لێم ئەترسێ و نایە بەلامەوە. پەلاماری دڕندان ئەدەم، لە وەخت و ناوەختا باڵ ئەگرمەوە بۆ نەهێشتنی ئەو شتانە کە ئاوی ڕوون لە ژیانی بوون لێڵ ئەکەن. ئەگەر خەم وەکوو تەم بێت بەسەرما، بە دڵی خۆشم و بە هەناسەی گەرمم، ئەو خەم و تەمە وەکوو بەفری بەر ڕەهێڵەی بەهار ئەتوێنمەوە.

بە دڵما نایەت بیر کردنەوە لە ئاسۆی گوزەران. شەو سەر ئەکەمە سەر بەرد، بە ڕۆژ ئەگەڕێم لە شاخ و لە هەرد. بۆنی گوڵ ئەکەم لە باخ و گوڵزار، بە نەشئە ئەدەم لە ئاوی ڕووبار، ئەخۆمەوە ئاو لە کانی دیار

و شێر بەرەو ڕووم بێت وەکوو پیر، بە هێزی جوانیم ئەو شێر و پیرە وەکوو موو لە شیر دەرکەم، بەو جۆرە دەریان ئەکەم. سەنگەر ئەدڕێنم، لەنگەر ئەڕووخێنم، ئاڵا ئەهەژێنم، دوژمن ئەترسێنم. نە ترسم لە شەوی زستانە، نە باکم بە تەوی پیرانە.

لەم دەوری گەنجییەما بە ڕەنجی شان، گەنجی درەخشان لە ڕۆژی ڕووناکی ئەهێنمەوە دەست. پیاوەتی بەسەروە ئەکەم، مەردایەتی پێ ئەنوێنم، شەوی ئاهەنگی پێ ئەسپێرم، هیچ بە دڵما نایە کە ئەمە خەو ئەبینم. ئەمە قسەی پیرانە کە ئەڵێن: ڕۆژی جوانی ڕیگی ڕەوانە، بە هێمنی دێت و بە گورجی دەوانە.

ئەوە ئەفسانەی ڕابردووانە کە ئەڵێن: جوانی هەتاوی بن دیوارانە، نان ئەو نانەیە ئیمڕۆ لە خوانە. جوان ڕوومەتی ئەبێ بە هێلانەی نیگای نازداران. چاوی ئەبێ بە جێگای دیمەنی گوڵزاران، دڵی ئەبێ بە باخچەی بەهەشتی دڵداران.

**ئەوەی پێی ئەڵێن خەم و پەژارە**
**بەلای جوانەوە گشت ئاوی پارە**
**هەر چاوی بڕیە ناوچاوی دۆستی**
**هومای ئارەزووی کەوتە سەربەستی**
**خۆی وا ئەبینێ کە شێر و پڵنگە**
**خاوەنی هەموو ئەسبابی جەنگە**
**سامانی دنیا ڕووبەرووی کە بێت**
**خۆی لێ لائەدا هەر یاری پێ بێت**
**دنیا ڕۆژێکە ئەویش جوانی**
**خوا نەکا بڕوا تۆ وا ئەزانی**

ئەو گۆچانەی تۆ خۆتی پێ ئەگریتەوە، من مامزی سارای پێ ئەهێنمەوە. نە ئەزانم بێخەوی چییە، نە ئەزانم برسیەتی بۆ کێیە. ئەگەڕێم بە باغا گوڵەوچن ئەکەم. ئەیگرم بە دەستم، ئەیبەم بۆ دۆستم، بۆنی پێوە بکا بە بێنی درێژ، کە من سەیری کەم ئەبم گێژ و وێژ. بەڵام ئەو گێژییە دونیایەکە کە پەردەی قیامەت ئەدڕێ و ئاوی حەیات لە کێوی قافەوە دێنێت.

ئەمجا باوکی پیر دێتە قسە و ئەڵێ:

ڕۆڵەم ڕاستە! ڕۆژانی جوانی خوانێکە و لە دیوەخانێکە، خوانی نیازە لە دیوەخانی بێ نیازە. بەڵام ئەو ڕۆژە وەکوو ئاوی پار هیچ نابێ دیار. پیری ئاخر سەرمایەی ژیانە، وا مەزانە سەرمایەیەکی بێسەرمایەیە؛ کاڵایەکی گرانبەهایە کە لە تەونی ڕەنگاوڕەنگی دنیا دروست بووە. لە شیرەی هەموو گوڵێکی مژیوە، لە ڕەنگی هەموو گوڵێکی بریوە. ئاوەنیاکەی تاقیکردنەوەیە، بەرەکەی پاڵاوتەی هەموو کارەساتێکە. لە بۆتەی ساردی و گەرمی دنیادا قاڵ بۆتەوە، لە ئاوازی هەموو سازێك گوێ پڕ بۆتەوە. خۆی بووە بە وجاخێك کە هەموو جۆرە نانێکی لەسەرە. کێ چی ئارەزوو بکا لەوەی ئەداتێ. پەندەکانی ئەو ڕێگای ڕووناکە بۆ ڕێبازی جوانان. بیری، کانیاوێکە کە بە سەدها جۆگەی لێ هەڵگیراوە. داستانی زەمان و کارەساتی دەوران هەموو لەو ڕووی داوە. ئەوەی پیر لە خشتی گڵا ئەیبینێ، جوان لەناو ئاوێنەشا بە تەواوی نایبینێ.

ڕابەری پادشاهان، ئاوێژی ڕەوالان، خەمڕەوێنی ناو ماڵان، ئاسۆی بیری چاوکاڵان، ئەو پیرەیە کە ڕەنگ ئەڕێژێ، خەت ئەکێشێ. لە ڕۆژی شەڕا فەرماندارە، کەماندارە، دڵبێدارە. فیکری ئەو خەندەق ئەڕمێنێ، دوژمن ئەترسێنێ، ئاو سەرەوژوور ئەبا، تاو بە پشوو ئەدا.

ڕۆڵە! بەڵێ پیر مووی سپییە، بەڵام هەر ڕۆستەمە و لە زاڵ ئەبێ.

بەڵێ کافرە بەلای ڕوومەت گوڵانەوە، بەڵام ئیسلامە بەلای ڕۆشن دڵانەوە. نەتبیستووە ئەو نازدارە کە ئەڵێ:

ناچم بەلای جوانەوە خۆی لا ئەدا لە بانەوە
ئەچێ بەلای میوانەوە خۆم ئەخەمە لای پیران
لە دڵ ئەوا ئەبم جوان قەدرزانە هەر زەمان

پیر ڕەنجی بە گەنجە؛ گەنجی خەزنەیە. دەستی تێری لەسەر سکی ماندووە. هەورازی بڕیوە، نشێوی بەجێ هێشتووە. کە دانامەی داخست باری حەسانەوەی خست. لە دیوەخانا لە سەرەوە، بەلای پادشاهان لە بەرەوەیە؛ عومری هەموو گەوهەرە، ڕازی هەموو جەوهەرە، مەلی وەقار بە سەریەوە، لەنگەر ئەخا بە دەوریەوە.

ڕۆڵە! بەڵێ پیاوی پیر بازووی بێ هێزە، بەڵام بە بیر و هۆش بەهێزە. فیکری، موورووی ڕەش لە شەوی تاریکا ئەدۆزێتەوە. ئاوێنەی خەیاڵی مرواری بنی دەریا ئەبینێتەوە. پەلکەزێڕینەی ئێواران ئەبەستێ بە گزنگی هەتاوی بەیانیانەوە. ئەزانێ دوڕ و زمڕووتی جوانیی کە لە کۆشیا بوو، کەوت، با چاوی وەقاریشی ببڕێتە سەر ئەرز، بەڵام زانایە بەوە کە شتێك کەوت، تازە نایەتەوە دەست. بۆیە سەیری ئەرز ئەکا بۆ ئەوە ئەو زەوییە شەرمی لێ بکا.

شەرمە بۆ جوان پێ بنێتە سەر ئەرز
چونکە تیایەتی سەد هەزار سەربەرز
پۆلی چاوکاڵان دەستەی نازداران
بازووی پاڵەوان ڕمەی شاسواران
بێدەنگ لە وێدان بەکش و ماتی
سەریان ناوەتەو لەبەر نەهاتی

کورِم! ئەو لاوەی کەوا پیر ئەبێ، ئەو ئەرزەی وتم، هەر بۆی شێت ئەبێ، ئەم دڵە گەرمە بۆی، ئەویش بەشەرمە، هەریەکە بۆ یەك دڵەکەی گەرمە. سپی بەرگی مەلائیکەیە، لەو بەرگە کەوتۆتە سەر ئەو کەسە کە مەلائیکە ڕووی تێ ئەکا، هێزی جوانی پێزی پیرییە. زەمانی جوانی ڕێبازە بۆ پیری، هەرکە بمێنێ ئەبێ بیبینێ. بە پاچ و بێڵ تێی نەکەوێ، تا لە ڕۆژی پیریدا تێنەکەوێ. لە جوانیدا وا مەزانە هەموو ڕۆژێ هەر وایە، ئەبێ بزانی کە ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە.

**پیـــری ئەم دنیا گەر ماڵی هەبێ    هەزاران گەنجی لە دەرماڵ ئەبێ**
**ئەو گەنجە کەوا بێبەهرەی ماڵە    لە هــەردوو بارا دەســتی بەتاڵە**
**تۆ ئەبی بــە من، من نابمەوە تۆ    دەستی چاککاری بەرمەدە و بڕۆ**

١٢٥. ئەوە چ سۆزێکە کە وێنەی تەمی دەماوەند لەو دڵە بەکوڵەوە ئەدا بەیەکا و لە دوورەوە بۆی ئەکەوێتە گمە. خاڵی سەر گۆنای یاری هیچ شتێکی‌تر نییە بیچوێنێ. بەو تەنیا ئاگری زەردەشتی نەبێ کە لە ئاتەشگای سەر دیارانەوە بلێسە ئەدا و ئەڵێ:

**خاڵــێ وا وەبــان گۆنای پیــرۆزەو**
**وەك شــەم ئەســووزێ وە نەکەرۆزەو**

١٢٦. زۆراب‌ئاغا لە کوردی تورکیا و وڵاتی جزیرە بوو؛ ٢٢٠ ساڵ ژیا. ساڵی (١٩٧٧) عەمری خوای کرد. بنەماڵەیەکی پێکەوە نا لە ١٨٠ کەس؛ ئەمانە هەموو کوڕ و کوڕەزا و کچ و کچەزا و کەسانی‌تری بنەماڵەکە بوون.

بیر و هۆشی زۆر تەواو بوو؛ خۆی بۆ خۆی مێژووی ئەو ٢٢٠ ساڵە بوو، هەر لە زەمانی ناپلیۆنەوە ئەیهێنا تا سەلاتینی عوسمانی.

١٢٧. ئەزانی لە ساڵی (١٩٣٩)ەوە تا ساڵی (١٩٧٩) ـ واتە ماوەی ئەم چل ساڵە ـ تەنیا ٣٦ ڕۆژ شەڕ نەبووە. کە ئەڵێم نەبووە، واتە لە نێوان حوکمەتەکانا؛ ئەگینا لە نێوان بەرە و تایفەکانا ئەوە زۆر بووە، بەڵکوو لە نێوانی تاکەتاکەی خەڵکا.

(٢/٠٣٦/٨٠٠/٠٠٠/٠٠٠/٠٠٠) [!] ئەوەندە شەڕ قەوماوە؛ واتە چرکەیەك شەڕێکی تێدا بووە. لەم حسابەدا هەریەك تاقە کەسێکی ئادەمیزادە ئەگرین بە دەستەوە، واتە: یەکێك لەگەڵ یەکێکی‌تر لەسەر توێکڵە شووتی شەڕێکی کردووە. لە دوای ئەوە هەر ئەو کەسە لەگەڵ یەکێکی‌تر وەیا لەگەڵ کەسەی پێشوو لەسەر مووروویێك شەڕی کردووە. دوای ئەو یەکێکی‌تر لەگەڵ یەکێکی‌کەدا لەسەر سەلکێ چەوەنەر شەڕی کردووە، هەر وا پێوە بڕۆ.

من قسە لەوەوە ناکەم کە دوو کەس وەیا سەد کەس لە یەك کاتا لەسەر دوو شت وەیا سەد شت شەڕیان کردووە. ئەگەر ئەوە بێنینە ناوەوە، ئەو ئەبێ حسابی ئەوە بکەین کە ئەم ڕووناکی ڕۆژەی ئێمەی داگرتووە، تەنیا نیوەی ڕووناکییەکەیە؛ نیوەکەی بەهۆی ئەو شەڕ و جەنگانەوە تاریك بووە و ئەوان بەر ئەو نیوەیەیان گرتووە. جا ئیتر قسە لە شەڕی گیانلەبەرەکانی‌ترەوە مەکە.

١٢٨. پیاوێکی کوردی جاف ساڵێك ئەچێ بۆ حەج، لە تەوافا لەناو ئەو حەشامەتەدا ڕائەوەستێ و تەواف ئەکا. سەیر ئەکا ئەوان شتێك ئەڵێن ئەم هیچی لێی تێ‌ناگا و نازانێ وەکوو ئەوانیش بڵێ. بە هەر پاڵەپەستۆیەك ببێ خۆی لە قوفڵی کەعبە نزیك ئەخاتەوە و دەستی پێوە ئەگرێ و ئەڵێ: بینایی چاوان جارێك لێرەیت و جارێك لە دواوان.

وا لەو ڕێگە دوورەوە هاتگم بۆ خزمەتت، دەستم گرتگە وەو قوفڵە سوورەی بەردەمت. ئەمانە داویانە وە یەکا کەس نازانێ چی ئێژن. من وەو جۆری ئەوانە نازانم بێژم. توێ تۆ هەر یەك زوان بزانی؟ تۆ کە باشکی و ڕوغزایی و تەرخانیت دروست کردوێ، توێ زوانی ئەوانیش بزانی. وەو زوانەی خۆم ئێژم:

توێ لێم خۆش وی. باوك و دایکم و وەتەك پیزەی کارەکەرت چاویان لە دەمی منە، منیش چاوم لە دەمی تۆس. دەم و نفووسێکمان بۆ بخەرە کار لەو ڕۆژەدا کە ئێژن ڕۆژی حەلوەلایە، چاوێکت لێمانەو وێ. دنیا وە شەقی قیامەت ئەڕوا. ئێستە سێپەڕەی بەهاری شارەزوور ئاوەنیا بووگەسەوە و سەری داوە وە یەکا. کوڕەکوڕە لەو بناری بێسانسووره دەواریان هەڵداگە و مێگەل لە دەوریا خزمەخرمێسی. توخوا زوو پاڵمان پیوە نێ با بیانگرمەوە، چەن ڕۆژێکیتر بار ئەکەن ئەچن بۆ کوێستان، هیچ نەوێ با لە کلکەی شلێر و ناوخوانا فریایان کەوم.

ئەو ڕۆژە کە وە زوانی خۆت فەرمووت وە ئیسرافیل: فوو وە شاخەکەیا بکا، تێمەوە بۆ خزمەتت؛ ئەگەر لە دواوان نەتگرم خۆ لێرە هەر ئەتگرم.

گوناحی من فرەس، وەلێ عەفووی تۆ فرەفرەترە. یەکێ پیاو وێ ئەگەر داوای شتێکی لێ بکەن دەس وە ڕوویەوە نانێ! من لەو ڕێگە دوورە، وە پشت ئەو غەزەوەی خواوە کە پێی ئێژن وشتر هاتگم، داوای دوو شتت لێ ئەکەم:

یەکێ ئەوانەی کە وتم، لەگەڵ هۆزی مراوەیسیش وە خۆمەوە عافوومان بکەیت. یەکێ توێ دەس بگرێ وە باڵمەوە وە بێمزەڕەتی بڕۆمەوە بۆ ناو عێل. پێکوڕە ئیسە چاو لە درگان، ئیتر ماڵاواوێ.

(منیش ئەڵێم: نرخی گەوهەر گەوهەری ئەیزانێ).

١٢٩. مەلا حەسەنی شاتری ـ واتە مەلا حەسەنی ناوگردان ـ بۆی گێڕامەوە وتی: خاڵەمەحمووی حەمەی سەمینی وردەشاتری هەبوو، پیاوێکی پیری بەساڵاچوو بوو. داستانێکی ڕاز و نیازی باوکی و خوا هەبوو بە تەواوی لەبەری بوو. وتی: منیش ئاگری بیستنی ئەو داستانە هەڵیگرتم چووم بۆلای، بەڵکوو بۆم بگێڕێتەوە. هەرچەند کەم ئەیگێڕایەوە بەڵام لەبەر ئەوە تۆزێ خاتری ئەویستم، دەستی نەنا وە ڕوومەوە و بۆی گێڕامەوە وتی:

باوکم خوا بیخاتە ناو خەزێنەی ڕەحمەتی خۆیەوە! لە زەمانی حەمەپاشادا گشت جارێ لە ژێر دەوار و بەر دەوارا ئەیفەرموو: بینایی چاوان! نازانم بێژم تۆ چیت؟ ئەوەن ئەزانم ئەها ها، ئەوەی کە تا چاو بڕ ئەکا لەو درێژی ئاسمانە، تۆ گشتت دروست کردگە. هەر بڕۆ، هەر بڕۆ، هەر ناوڕێتەوە. پیاو وا ئەزانێ ئەوە بڕایەوە، کەچی هەر لە هەوەڵیەوەس. ئەگەر من دوو باڵم هەوێ و بڕۆم وەو ئاسمانەدا باڵەکانم شل ئەون و وا ئەزانم چووگم، کەچی ئاسمان هەر دوورتر ئەوێتەوە، گەرمە هەسوونێکم بەرچاو کەوێ، کەچی هیچ دیار نییە. کەواتە تۆ ئاسمانت وە بێ هەسوون ڕاگرتگە.

ئەو ئەستێرانە ئێژی چرای نیوەشەون، وەك کوڵمێخی دەروازەی بازاڕەکەی شارکوتیاگن وەو ئاسمانەدا کە ئێژی پیرۆزەیە. تۆ دەست وە گشت شتێکەوە ئەژەنیت، کەچی تۆیش دیار نیت. ڕزقی مار و مێروو ئەدەی لە پشت پەردەی غەیووەوە، کەچی ئەگەر من بێمە ئەو پشت پەردەیە تۆ لەوێش نیت. تۆ دەریا گەورەکان وە «زرێوار»یشەوە هەندێ جار ئەیانکەی وە یەخ، هەندێ جار ئەیانکەی وە ئاوی ڕووت، کەچی ئەو گشت گیاندارانە لە ناویانا هەر هەڵئەقونێنەوە. بەشی گشتیانت داگە، نایەڵی کەسیان وەبێ

ڕزق سەر بنێنەوە. من ئەو گیانەی لە بەرمایە تۆ داتنیاگە، لەگەڵ ئەوەدا کە وەمنەوەیە، من نازانم چییە. دەست ئەدەم وە دەوارەوە هەڵیئەدەم ئێژی ڕۆستەمم، کەچی نازانم ئەو زۆرە چییە کە تێمدایە و دەوارەکە هەڵئەدەم.

ئەو دەشتی «مێرگەپانە» لە وەختی بەهارا ـ خوا نەیوڕێ ـ پڕیەسی لە هەڵاڵە و بەیبوون، هەر گوڵێ وە ڕەنگێ ڕەنگ ئەداتەوە، گشتی تۆ دروستت کردگە. من وەم فرەزانی خۆمەوە سەرم تیا سڕ ماگە، نازانم چییە! یەك تۆمە، پەڕەی گوڵەکەی پەلێکی سوورە، پەلێکی کەوەس، خەتێکی زەردەوامە، تۆ لە گشتیا هەیت، کەچی وە چاویش ناوینرێیت.

ئاوەکەی سەراوی سوبحاناغا ئێژی هەزار چاوی قرژانگە و کۆ بووگەسەوە و بووگە وەو گۆمە کە ـ خوا نەیوڕێ ـ گشت مێگەلی جاف ئاوی لێ بخواتەوە هەر پێوە دیار نییە، تۆ زیادی ئەکەی کەچی تۆیش دیار نیت. جۆگە ئاوەکەی کە لە بەری هەڵئەگیرێ لە دوورەوە ئێژی ڕەشماری «بێسانسوور»ە وە پێچە و دەورە ئەڕوا، تۆ پاڵی پێوە ئەنیت کەچی تۆیش دیار نیت.

خۆزگا جارێك ئەبوویت وە میوانم، بەرەمەشکەیێ کەرەم بۆ دائەنایت، وە گەزۆی چەرموگی «بانە»وە نۆشی گیانت بکردایە، ئەوە ئەووە مفەڕك بۆ گشت مێگەلەکەم. وەلێ بێژم چی! پێم ڕازی ناوی، سەرێ بکەی وەم کاولە ئاشەدا. تیت، وەلێ نە من ئەتوینم وە نە شتیش ئەخۆی. ئەزانم هەیت، وەلێ نازانم چیت؟ هەرچی من بێژم تۆ هەو نیت.

تۆ فرە بێکەسی، کەچی لە گشت کەسدارەکان و لە گشت عەشرەتی جاف وەتواناتری. ئێژن دوو کەس وەیەکەوە دانیشن چاویان لە یەکە، تۆ لە پاڵ منایت تۆ چاوت لە منە؛ کەچی من تۆ ناوینم، ئەمە مۆجزە نییە؟

ئەو ساڵە من چووم بۆ حەج، وتیان: تۆ لەو وڵاتە و لەو وەرەیت. ماڵتم دی؛ کەچی خۆتم نەدی. وەختێ هاتمەوە ژێر دەوارەکەی خۆمان لە

«قەدەفەر» وتیان: تۆ لیرەش هەیت؛ نازانم تۆ چیت وا لە گشت لایەکیت؟!.

بینایـی چـاوان! ئەوەنـدە ئەزانم باوکێکـت نییە و نەتبووە پێت بێژێ: ڕۆڵە. کوڕیشت نییە و نەتبووە تا پێت بێژێ: باوە. نازانم تۆ چیت و چۆن بووگیت؟ هەرچەنده ورد ئەومەوە لە کەس ناکەیت. خاس ئێژم؛ چونکە ئەگـەر لـە کەسـت بکردایە هـەر زوو سـەرت تیا ئەچوو. کەسیش نییە یاریـدەت بدا، بۆ تون بوونەوەی. وە کەلام! ئەگەر ببوایە ئیشت بۆ نەئەکرا. وەکوو ئاسیاوەکەی حەمەسەنی حەمەی نالە لە «میشیاو»، هەتا هەر خۆی بوو دایمەگەڕ بوو، کە بوو وە شەریـك لەگەڵ کاورای «بەرلووتی»ـدا دوو ڕۆژ ئەگەڕا و چوار ڕۆژ ئەوێسا.

وەکوو پێم وتگیت؛ ئەزانم هەیت، لە گشـت لایەك هەیت، بەڵام وە تاقێق نازانـم لـە کام لایـت تا بێـم وەلاتەوە، بتگـرم. خۆ وەو سەیساقە! لە بن دەسـی منیشـەوە هەیت، وەلێ لێمەوە دیار نیت. فێڵێکی خاسـت بـۆ خـۆت دیگەسـەوە کە خـۆت دەرناخەی بـۆ کەس!. ئەوەنـدە دەردت داوە وەو خەڵکە، ئەگەر خۆتت دەربخستایە ڕۆژی خۆتت ئەوینی!؛ وە کەلام! هەر پەلێکت ئەکەوتە دەس هەزار کەس!.

دەسا بینایی چاوان! ـ بەردت لێ نەوارێ ـ بکە وە خاتری ئەو دەم و نفووسەت، خۆتم لە سووچێکەوە بۆ دەرخە با لەم گێژاوە دەرچم بزانم تۆ چیـت؟ وە سەیساق و باڵانتەران هەرچـێ بێژم ڕاس ئەکەم. وا مەزانە شتێکت لێ ئەکەم. قسەکانت وەلاوە «با» نەوێت. پیاوی درۆزن بناسە!.



# گەنجی درەخشان

**١٣٠.** پیاوێـك هەبـوو لـە ئاكـرێ «پسـمام عیسـۆ»یان پـێ ئـەوت. كەوتبووە ساڵەوە؛ لەوانەبوو پەكێ بكەوێ. ژنێكی هەبوو «خاتوو زین» ئەم لەو خرابتری بەسەر هاتبوو. لەگەڵ ئەوەشا بە تەواوی زاڵ بووبوو بەسەر مام عیسۆدا. ئەم بیوتایە پیاز ئەو ئەیوت: سیر.

مریشـكێكی زۆر قەڵەویان هەبوو، پسـمام عیسـۆ مرخی لێی خۆش كردبـوو. هەرچەنـد بهاتایەتـە سـەر ئەوە كـە بیوتایە خاتوو زین با سـەری ببڕیـن، خاتـوو زیـن بـە دارێـك ڕاوی ئـەنا؛ ڕاوی پسمام عیسـۆ. پسـمام عیسۆیـش هەر وەختەبوو سوێی بێتەوە.

ئەم پسـمام عیسـۆیـە ئامۆزایەكی هەبوو، ئەویش وەكوو ئەم چووبوە سـاڵەوە. ڕۆژێـك چـووە لای پێـی وت: پسـمام ڕاسـتی مـن وەختـە دڵم دەرچێ بۆ گۆشتی مریشك. مریشـكێكی قەڵەومان هەیە هەرچەند ئەكەم خاتوو زین نایەڵێ سەری ببڕین و منیش هەر ئەوە نییە كە سوێم بێتەوە. ئەویش هەندێ ڕاما و پاشان وتی: تۆ بچۆ خۆت ئاڵۆز بكە. ئەویش دێت سـەر ئەخاتـە سـەرت. هیچـی پـێ مەڵێ. لە پاش ئـەوە كـە زۆر لەگەڵتا خەریك ئەبێ، ئەمجا بڵێ: ڕاستی وانێكەكەم شكاوە!. ئەمە بڵێ و ئیتر لێی گەڕێ.

پسمام عیسۆ ئەچێتەوە ماڵەوە و دەست ئەكا بە عاجزی و خۆ بادان و هاوار و ناڵەكردن. خاتوو زین دێت بە لایەوە ئەڵێ: ئەوە چیتە؟ ئەمیش

دەنگ ناکا و هەر هاوار ئەکا. خاتوو زین بێ تاقەت ئەبێ ئەڵێ: پیاوەکە بۆ دەنگ ناکەی؟ ئاخر قسە بکە بزانم چیتە. ئەڵێ: خاتوو زین لە قسە نایە و ناگوترێ. خاتوو زین تۆزێ شێرگیرتر ئەبێ و زیاتر سەر ئەخاتە سەری. پسمام عیسۆ ئەڵێ: خاتوو زین واز بێنە تازە ئیتر من ژیانم بۆ چییە؟ ئەڵێ: ئەیەڕۆ بۆچی؟ ئەڵێ: خاتوو زین ئەوی ڕاستی بێ دەعباکەم شکاوە. تازە ئیتر مردنم باشترە.

خاتوو زین ئاگر ئەکەوێتە کەوڵی و ئەڵێ: بەقوربانت بم! تۆ نەخۆشیت، دەردت بکەوێ لە من؛ بچمە لای کێ تا داودەرمانێکت بۆ دروست بکا؟ ئەڵێ: خاتوو زین تازە هیچ داودەرمان نەماوە. خاتوو زین ئاگری جگەر هەڵئەگرێ و ئەچێ بۆلای مامی پسمام عیسۆ پێی ئەڵێ: لە دەورت گەڕێم! عیسۆ نەخۆشە بزانە نوشتەیە، شتێکی بۆ ناکەی. ئەڵێ: نەخۆشییەکەی چییە؟ خاتوو زین لە ڕووی هەڵنایە بیڵێت، لە ئەنجاما لەبەر ئاگری جگەر هەر پێی ئەڵێت. ئەویش ئەڵێ: ئەمە ئاسانە، من لە کتێبا دیومە ئەگەر یەکێ تووشی دەردی کێر شکان بوو، بە ڕۆنی مریشکێکی قەڵەو چەور بکرێ جێگای خۆی ئەگرێتەوە. جا ئەگەر ئەتوانی مریشکێکی وای بۆ پەیدا کەیت چاری دێت، ئەگینا تازە لە دەست دەرچووە.

خاتوو زین ئەڵێ: مریشکێکی زۆر قەڵەومان هەیە هەر ئێستە ئەچم بۆی سەرئەبرم. ئەویش ئەڵێ: ئاوەکەشی لەگەڵ برنجدا بۆ دروست بکە. ئەڵێ: چۆن نایکەم.

خاتوو زین خلەخل هەڕا ئەکاتەوە بۆ ماڵەوە خێرا مریشکەکە سەر ئەبڕێ و ڕۆنەکەی ئەگرێ و گورج ئەچێ دەرپێکە بە پسمام عیسۆ دائەکەنێ و ئەکەوێتە مشتوماڵ کردنی خەنجەرەکەی. بە تەبیعەت شکاوی نامێنێ و سەر بەرز ئەکاتەوە و ئەکەوێتە نزگەرە کردن. خاتوو زین ئەڵێ: ئۆ یارەببی

ڕزگار بـی پسمام بـۆ دەرمانێ نواندت. بەڵام عیسۆ، تـۆ پیاوێکی خراپ بوویت، شتی وات لێ قەومابوو بۆ زوو دەنگت نەئەکرد؟ دە هەستە ئەوە ئاوەکەشم بە برنجەوە بۆ لێ ناویت بیخۆ. جارێکی‌تر وریا بە و ئاگاداری خۆت بە با تووش نەبیتەوە. پسمام عیسۆ ئیتر بە ئاواتی خۆی گەیشت.

**١٣١.** مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لە هەولێر وەکوو شێخ بابەعەلی تەکیەیـی لـە سولەیمانی لـە مەلایەتی و لە قسەخۆشـی و لە تەمەن‌درێژیدا شانیان ئەدا لە شانی یەك.

لە سەردەمی مەلا ئەفەندی هەولێردا بۆ ئەو فەقێیانە کە لە خزمەتی ئەودا لە مزگەوتەکەی ئەو ئەیانخوێند، هەریەکە مانگێ دوانزە ڕووپیەی لە کیسەی خۆی بۆ بڕیبوونەوە. سامانی مەلا ئەفەندیش وەکوو مەلایەتییەکەی هەر بەناوبانگ بوو.

جارێك مەلا حەمەمین ناوێکی خۆشناوی لە گوندی «هەرتەل»ـەوە دێ بۆ هەولێـر بـۆ ئەوە لـە خزمەتی مـەلا ئەفەندیدا بخوێنـێ و مانگێ دوانزە ڕووپیەش وەربگرێ. دامەزران لەلای مەلا ئەفەندی زۆر بە گران ئەکەوت؛ چونکە تا شوێنی یەکێك خاڵی نەبوایە، یەکێکی‌تر لە جێگای دانەئەمەزرا. ئەم مەلا حەمەمینەش ماوەیەکی زۆر بەمەوە خەریك بوو شوێنەکەی دەست نەدەکەوت. ڕۆژێك لەلای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە دەردەدڵ ئـەکا کـە لـە مێـژە خەریکـە لای مـەلا ئەفەنـدی دامـەزرێ و کەچی هەر دانەمەزراوە. مەلا ساڵحیش ئەڵێ:

ئەرێ بابم تۆ لە هەرتەل لۆ دەبزویت؟ دەرزەکەت لەوێ هەیە، هیچ نەبێ مانگێ بایـی دوانزە ڕووپیەش هەر کەران دەگێیت! ئیتر جگە لە نانەکەت.

**١٣٢.** کابرایەك ئەچێتە لای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ئەڵێ: قوربان بە دەستنوێژێك چەند نوێژ دەکرێ؟ ئەڵێ: زۆر. ئەڵێ: نوێژی سوننەتانیشی پێ دەکرێ؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: هی قەزایانیش. ئەڵێ: بەڵێ. کابرا هەر زۆری لەسەر ئەڕوا؛ مەلا ساڵح لە ئاخرا ئەڵێ: «دە بڕۆ مردیت مرێ! بە دەستنوێژێك سەد کەرانی پێ بگێ».

**١٣٣.** دوو کابرا کێشەیەك لە بەینیانا ڕوو ئەدا، یەکێکیان داوای هەندێ پارەی قەرز لەوی‌کەیان ئەکا. ئەویش ئەڵێ: لام نییە. ئەنجامیان ئەگاتە شەرعکردن و ئەچنە لای مەلا ساڵحی کۆزەپانکە. مەلا بە کابرای داواکەر ئەڵێ: شایەتت هەیە؟. ئەڵێ: نەوەڵڵا. بە کابرای داوا لێکراو ئەڵێ: سوێند ئەخۆی کە ئەم پارەیەت لەلا نییە؟. ئەڵێ: بەڵێ. ئەمجا بە کابرای داواکەر ئەڵێ: سوێندی ئەدەی؟ ئەڵێ: بەڵێ، بچێت دەستنوێژ بشوا و بێت سوێندم بۆ بخوا. کابرای داوا لێکراو ئەڵێ: دەستنوێژم هەیە و ئێستە قورعانی بۆ ئەخۆم.

کابرای داواکەر ئەڵێ: هەر ئەبێ دەستنوێژ بشوا. مەلاش ئەڵێ: باوکم ئەوا ئەڵێ: دەستنوێژم هەیە، ئیتر دەستنوێژی چی بشواتەوە؟ کابرای داواکەر ئەڵێ: نابێ، تا لە بەرچاومەوە دەستنوێژ نەشوا قایل نابم. ئیتر مەلا ساڵح ئەگاتە تینی و ئەڵێ:

مردیت مرێ لۆ هێریت! ئەوا ئەچێ لە بەرچاوتەوە دەستنوێژ ئەشوا و پاشان دەست ئەخاتە سەر کێری و لۆت دەنێرێ. ئیتر تۆ ئەمە چییە گرتووتە سەر زمان هەر ئەرێی ئەبێ لە بەرچاومەوە دەستنوێژ بشوا.

**١٣٤.** مەردۆخییەکان کتێبێك هەیە لە «نەحو»دا «جامی» پێ‌ئەڵێن. لەبەر ئەوەی کە دوعاکردێکی مەولانای جامی هەیە بەرانبەریان،

بۆیە ئەم کتێبە ناخوێنن، تاقیی کراوەتەوە هەرکامیان بیخوێنن یا ئەمرن لە پێش تەواوکردنیا، یا لە خوێندن پەکیان ئەکەوێ، ئیتر لەبەر ئەمە قەت توخنی خوێندنی ناکەون؛ بەڵام بە دەرز ئەیلێنەوە.

جارێ فەقێیەکی ئەو خۆشناوەتییە «وەسان» ناو لهلای مەلایەکی مەردۆخی ئەم کتێبە بە دەرز ئەخوێنێ، بە دوو ساڵ ئەو وەختە تەواوی ئەکا. لە پاش تەواوکردنی، مەلاکە لێی ئەپرسێ: ها کاکە فەقێ! چۆن بووی لە خوێندنی ئەم کتێبەدا؟ ئەویش ئەڵێ: مامۆستا ئەوەتی من دەستم داوە بە خوێندنەوە، ئەوەندەی ئەم کتێبە لەزەتم نەبردووە و ئەوەندەی ئەم کتێبە بە پوختی تێ نەگەیشتووم. ئەویش ئەڵێ: دەسا کاکە فەقێ وەختی خۆی من ئەم کتێبەم نەخوێندووە، چاوت لێیە چۆن بە پوختی پێم وتیت؟ فەقێ کە ئەمە ئەبیسێ ڕەنگێکی زەرد و مۆر و شین هەڵدێنێ و ئەڵێ: چما تۆ مەردۆخیت، هەی قوون فرەباب! تۆ کە وەختی خۆی نەتخوێندییە لۆ بە منی دەریی؟! تۆ ئەمە دوو سارانە لۆ حەمری منت بە فیڕۆ بردیە هەی خودا بتگرێ ئینشائەڵڵا!.

١٣٥. کابرایەك هەبوو «تووتك»یان پێ ئەوت. سەرێکی زۆر بچووکی هەبوو ئەتوت گوێزە. ڕۆژێك کابرایەکی‌تر بە بەرە لەپی دەستێکی، سەری گرت و سووکە سووڕێکی پێ دا و وتی: ئەم سەرە بچووکە چییە؟ تووتك وتی: وەڵڵا خۆم وام پێ خۆش بوو.

١٣٦. مەحمووبەگی ڕەزابەگی جاف گێڕایەوەوتی: کابرایەکی کەماڵەیی دەروێشی شێخ عەبدولکەریم ئەوێ - ڕۆحم وە فیای وێ - ڕۆژێك کابرا ئەچێ بۆ خزمەتی شێخ و دەستی ماچ ئەکا. شێخ لەو کاتەدا تۆزێ توورە ئەبێ لەبەر هەندێ پەژارەی تایبەتی خۆی کە لە دڵیا ئەبێ.

بە دەروێشەکە ئەڵێ: بڕۆ لاچۆ دەستم ماچ مەکە، من شێخ نیم. دەروێش تۆزێ لێی مۆڕ ئەبێتەوە و پێی ئەڵێ: گووت خوارد دەسا وەڵڵا شێخیت!.

١٣٧. شێخ محەمەدی شێخ جەلال بۆی گێڕامەوە وتی: حەمەڕەشید هەبوو پۆلیس بوو، بە دەوریە ئەچێتە دێی «فیکەدەرە» لە قەرەداغ. لەوێ ئەچێتە ماڵێك. پیاو لە ماڵ نابێ، ژنەکە هەر خێرا هەڵئەستێ نان و چا و شتە جێبەجێ ئەکا. خۆت ئەزانی داری دوابڕاوی قەرەداغ تەڕە، هەڵنابێ. ژنە هەر فووی لێ ئەکا و حەمەڕەشیدیش بە بەرگی پۆلیسەوە دانیشتووە. ژنە ئەوەندە فوو ئەکا ـ بلامانێ ـ یەکێکی پیا دێنێ. مناڵەکەی خۆی لە تەنیشتیەوە ئەبێ بە چەپۆك بەر ئەبێتە سەروگوێلاکی مناڵی بەستەزمان، ئەڵێ: باوانت شێوێ! حەیای عینسان ئەبەی. بەم ئیشەی لە حەمەڕەشیدی ئەشارێتەوە.

پاش ئەوەکە نان و چا پێ‌ئەگا و حەمەڕەشید نان ئەخوا. هەڵئەستێ بڕوا، لاق بەرز ئەکاتەوە تڕێکی ناقۆڵا ئەکەنێ و ئەویش بەر ئەبێتە سەروپۆتەلاکی مناڵە و دەست ئەکا بە لێدانی و ئەڵێ: مردووت مرێ حەیای پیاو ئەبەی. ژنەکە ئەڵێ: باوکم بۆچ لە مناڵەکەم ئەدەی؟ ئەمە لە باتی پیاوەتیمان کە تێر نان و چات خواردووە، ئاوا جەزامان ئەدەیتەوە کە لە مناڵەکەمان ئەدەیت؟ حەمەڕەشیدیش ئەڵێ: بەخوا دایکم من وامزانی هەرکە لەم ماڵەدا بتڕێ ئەبێ لەم مناڵە بدا!.

١٣٨. شێخ مارفێکی «زلزلە»یی هەبوو لە سولەیمانی نوشتە و شتەی ئەکرد بۆ نەخۆش. ئافرەتێك هەبوو ئەویش پوورە نەباتی ناو بوو. کوڕێکی جەحێلی هەبوو، زۆری خۆش ئەویست. ئەم کوڕە «تا»ی پێ هاتبوو؛ دایکی تووشی گەلێ هاتوچۆی لای شێخ و مەلا بووبوو پێوە.

لە ئاخر جارا ڕێی ئەکەوێتە لای شێخ مارفیش پێی ئەڵێ: بەقوربانت بم کوڕەکەم تایەکی قورسی لێ هاتووە ئەبێ نوشتەیەکم بۆ بکەی بۆی. ئەویش نوشتەیەکی بە دڵی بۆ ئەکا و بۆی قەد ئەکا و ئەیداتێ، پێی ئەڵێ:

پوورێ نەبات! ئەمە لەناو ئاودا بیشۆوە و ئاوەکەی بدەرێ بیخواتەوە؛ بەڵام هەر بۆ زیادەبڕشت دووسێ سڵپاتەشی بدەری بیخوا بە هیممەتی شێخان چاك ئەبێتەوە.

**١٣٩.** کوڕێکی تەوێڵەیی هەبوو بە عەسکەری ڕێی ئەکەوێتە ئەو وڵاتی عەرەبستانە و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ وڵات. ڕۆژێك لە چاخانەکەی تەوێڵە لەناو کوڕوکاڵا کڵاوەکەی لار دائەنێ و قاچ ئەخاتە سەر قاچ و بە فیزێکەوە دائەنیشێ. لەو کاتەدا دوو کوڕی میوانی دێن، ئەویش بانگ ئەکا لە چایچییەکە ئا «ثت چا» بێنە! (ست چا). ئەمەش بۆیە بەم جۆرە ئەڵێ: بۆ ئەوە پیشانی هاوڕێکان و دانیشتووی چاخانەکەی بدا کە عەرەبی چاك ئەزانێ. کابرای چایچی شەش چا دێنێت، سێ چای بۆ ئەوان دائەنێت و سیانی ئەمێنێتەوە. کوڕە عەسکەری تەوێڵەیی واقی وڕ ئەمێنێ بەر ئەنێتە بنا گوێ یەکێ لە هاوڕێکانیەوە و ئەڵێ:

«بۆچی "ثتە" ثێ نییە؟» بۆچی "ستە" سێ نییە؟.

**١٤٠.** لە بەغدادا گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ هەبوو «محەمەد گەبانچی»سیان پێ ئەوت. لە ڕاستیدا ئەم پیاوە خاوەنی مەقاماتی عێراق و کۆن بووبوو تیایا. لەبەر پایەشناسی ئەم پیاوە، حوکوومەتی بەغدای ساڵی (١٩٦٩) کۆبوونەوەیەکی لە تەلەفزیۆنی بەغدادا بۆ کرد. هەرچی هونەرمەندی گۆرانی و مەقامات هەبوو کۆی کردەوە و هەریەکە لەمانە بە ئەندازەی دەسەڵات بە گۆرانی بە باڵای گەبانچیدا هەڵیان

ئەدا، وە ئەم گۆرانی و ئاهەنگە، درابوو بە ئێستگەی ڕادیۆش. دیارە ئەمانە هەموو جار ڕوویان ئەکردە محەمەد کە ئەویش خۆی لە کۆڕەکەدا دانیشتبوو بە شیعر و گۆرانی ئەیانوت: «یامحمد».

مام پیرداود لای منیش لە نیوەی عومری بەم لاوە لە بەغدا ڕای بواردبوو، بەڵام یەك تاقە وشەی عەرەبی فێر نەبووبوو. هەرکاتێ کە گۆرانیبێژەکان ئەیانوت: یا محەمەد ئەم ئەیوت: «صلى الله عليه وسلم». نەیئەزانی دنیا چ باسە، وا تێئەگەیشت ئەمە مەولوودییە و بە باڵای پێغەمبەرا ئەڵێن و ئەو دێنن!.

١٤١. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: حاجی مەلا جەلالێك هەبوو لە سولەیمانی، پیاوێکی لەخواترس و دڵپاك بوو. ڕۆژێك لە مزگەوتەکەی خۆیا وەعز دائەدا و ئەڵێ:

خوا بۆیە مووسای ناو نایە مووسا چونکە مووسای ناو بوو؛ وە بۆیە فیرعەونیشی ناو نایە فیرعەون چونکە فیرعەونی ناو بوو. دەسا خوایە بۆ خاتری ئەم فرعەونە لە ئێمەو لە مووساش خۆش ببی. ئەوی‌تریشی بۆ سبەینێ!.

١٤٢. دیسان گێڕایەوە وتی: هەر لەو سەردەمە کۆنەدا مامە شێخ مستەفای شێخ نەجیب سەر ئەخاتە سەر ئەو حاجی مەلا جەلالە لەلایەن چوار ئیمامەکەوە. لە ئەنجاما حاجی مەلا ئەڵێ: ئەم موجتەهیدانە هاوچەرخ نەبوون. ئەویش پێی ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: ئیمامی شافیعی لە میحرابەکەدا نوێژی ئەکرد، ئیمامی حەنەفی چوو تووتکەسەگێکی لە حەوزەکە هەڵکێشا و فڕێی دایە کۆشی شافیعییەوە. ئەویش هەستا بەر بووە جنێودان بە ئیمامی حەنەفی و لەیەك هەڵدان پەیدا بوو جا

لەبەر ئەمەیە کە هاوچەرخ نین!.

١٤٣. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: حاجی مەلا جەلالێك هەبوو لە سولەیمانی ڕۆژێـك باسـی زەکاتـی لـێ ئەپرسـن کـە چۆنـە و چـۆن نییـە؟ ئەویش ئەڵێ: من ئەوەندەی لێ ئەزانم کە خواوەنتەعالا ناوی «شەعوور» دێنێ لە قورعانا ئەوە مەبەستی «جۆ»یە!.

١٤٤. بەخوا با نەبێ بە گزی، منیش جارێك لەلای شێخ محەمەدی قزلْجی لەو حاجی مەلا جەلالەم پرسی: کە مەلاکانی سولەیمانی چۆنـن و چـۆن نین و چۆن ڕائەبوێـرن؟ وتی: «فڵانی دەنگ مەکە، زۆر خراپ و ناجسنن». وتم: بۆچی؟ وتی: کورە هەموو ئیش و کار و تاعەتێکیان هاتۆتە سەر گاڵتەکردن بە من.

ئەمەش کە من ئەیگێڕمەوە لە ڕۆژی (١٩٥٧/٥/٢٤)دا بوو لە مەدرەسەی «نائیلە خاتوون» لە بەغدا.

١٤٥. ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم گێڕایەوە وتی: ئەوا لە سەردەمی خۆیا ماڵمان لەولای خانە سووتاوەوەیە لە سولەیمانی. گەنجایەتی منالیمە، ڕقم لە عەتای حاجی کاکەحەمەی شـاڵی هەڵگرتووە؛ نایەڵم بە تەقەی تفەنگا بەو کۆڵانەی ئێمەدا بڕوا. هەر لەگەڵ دەرئەکەوت، ئەکەوتمە شوێنی دەست لەسەر شان بە جنێو و بە بەرد تێگرتن کونەمشکم لێی کردبوو بە عەمارەت. خوا هەقە ئەویش کە چاوی بە من ئەکەوت شوێن نەبـوو خـۆی تیا بگرێتـەوە؛ هەر چوار هەنگاوی ئەکـرد بە هەنگاوێك و بۆی دەرئەچوو.

ئەگـەر جارێـك بیانناردایـە بۆ خـان و بازاڕ، وەیا خۆی ئیشـی بە بازاڕ ببوایـە، ئەبوایـە لـە ڕێگایەکـی زۆر دوورەوە هەمـوو کۆڵانەکانـی ببڕیایە،

ئەو وەختە بچوایە بۆ بازاڕ؛ ئەمەش هەموو لە ترسی من!.

ماوەیەکی زۆر ئەم زاڵیيەی من و ئەو ترسەی ئەو درێژەی کێشا؛ چ یارای ئەوەی هەبوو بەو کۆڵانەی ئێمەدا تێپەڕێ! وتی: ئەوا ڕۆژێك سەیرم کرد عەتا لەسەر کۆڵانەکەوە دەرکەوت. هەر لە دوورەوە بۆی چووم و دەستم کرد بە جنێودان پێی کە چۆن توانیوتە سەر بکەی بەم کۆڵانەدا؟ وتی: سەیرم کرد ئەو عەتایە کە جاران چاوی بە من بکەوتایە شوێن نەبوو خۆی تیا بگرێتەوە، هیچ گوێی نەدامێ هەر هات. من لەمە زۆر تووڕە بووم، دەستم کرد بە قسە پێ وتنی و وتم: ئەوە بەرەو ڕووم دیت؟ سەیرم کرد ئەویش دەستی کرد بە جنێودان بە من و هەر دێتە پێشیشەوە. من کە ئەمەم دی هەندێ لە گیڤ بوونەوەکەی خۆمم کەم کردەوە و لە شوێنەکەی خۆم وەستام. نەخێر ئەو هەر دێتە پێشەوە و هیچ گوێم ناداتێ. وتی: من یەك دوو هەنگاو کشامەوە دواوە، ئەو هەر ناوەستێ و دێت؛ ئەوا جنێویش ئەدا. خۆ منیش لە جنێودان نەکەوتووم.

دانەویمەوە بۆ بەردێك و بەردێکم تێگرت ئەویش دانەوییەوە بۆ بەرد و بەردێکی گرتە من. من یەك دوو هەنگاویتر کشامەوە دواوە. ئەو هەر دێت و جنێو ئەدا و بەردم بۆ ئەهاوێژێ، سەیرم کرد بۆن و بەرامە ئەنجامێکی چاك نادا بەدەستەوە، بەخوا پشتم تێکرد و ئەمجا من کەوتمە هەڵاتن. گۆشەیەکی چاوم پێوەیە سەیر ئەکەم کەوتۆتە سەرم ها ئێستە بمگرێ، ها تۆزێکیکە، بە هەرجۆر بوو سەرم کردەوە بە ماڵی خۆمانا و دەرگاکەم داخست.

گوێم لێ بوو وتی: بۆم ڕاوەستە هەی وا و وات لێ بکەم؛ من ئەگەر بمزانیایە تۆ ئەوەندە حیزەڵەیت ئەمە دوو ساڵە بەم جۆرە خۆمم تووشی ئەم عەزیەت و دەردیسەری و کۆڵانە و کۆڵانە ئەکرد؟.

١٤٦. لەو بناری «دەشتەتاڵ»ـە پیاوێك هەبوو «سۆفی پیرۆت»ـی ناو بوو؛ جۆڵایـی ئەكـرد. میوانێكیـان هـات، ئەویـش لەسـەر پێ چاڵەكـە بـوو. دنیـا زسـتانە، ئاگـر كراوەتـەوە. كابـرای میـوان لەمبـەری ئاگردانەكەوە دانیشتووە و خێزانەكەی سۆفی پیرۆتیش لەو بەرەوە.

ژنەكە دەرپێكەی دڕابوو، دوابڕاوەكەی بە دەرەوە بوو. سۆفی پیرۆت چـاوی لـێ بـوو. لەناو پێچاڵەكـەدا مەكووكەكەی ئەهێنـا و ئەبرد ئەیوت: هەپووش مەپووش، ئەو كونە داپووش!

ژنە هەر تێ نەئەگەیشت. بە ناچاری سۆفی پیرۆت هەر بەدەم مەكووك كوتانەوە خێرا سەرەبزووتێكی لە ئاگرەكە دەرهێنا و هاویشتی بۆ ژنەكەی. سـەرەبزووت بـۆ نەچـێ بكـەوێ لـە دوابڕاوەكە. ژنە لـە تاوانا و لەبەر ئەو ناكاوییـە، هەڵبڵۆقایـەوە و لـە عـەزرەتانا ـ بلامانـێ ـ یەكێكـی پیـا هێنا. جا سۆفی پیرۆت مەكووكەكەی هەر ئەهێنا و ئەبرد و ئەیوت: هەتەر مەتەر ئەم لەو بەتەر!

١٤٧. دوكتۆر «عزّالدّین» گێڕایەوە وتی: ڕەئووفی سـەعەی فەتاح بۆی گێڕامـەوە وتـی: ئـەوا لە «بەسـرە»م؛ دنیا گەرمە، بـە نیوەڕوان ئەگەڕێمەوە بۆ میوانخانەكەم، بەڵام لەبەر ئەوە كە كەس نەبوو قسـەی لەگـەڵا بكـەم، لـەم ڕووەوە تۆزێ بێ تاقەت بووم. ڕۆژێـك سـەیرم كرد وا كابرایەكی هەورامی لەو ناوەدا خەریكی حەماڵی و شتەیە، ئەویـش بە نیـوەڕوان پـەنا دیوارێـك هەبوو، ئەچوو لەوێ ئەحەسایەوە. بەزەییم پیا هاتەوە، بانگم كردە لای خۆم پێم وت: برام هەموو ڕۆژێ بە نیوەڕوان وەرە لای من نیوەڕۆژەی خۆت بكە. لەم سێبەری ژووری ئوتێلەدا بحەسێوە. ئـاوی سـارد بخـۆرەوە. كـە دنیا بوو بە عەسـر و فێنك داهـات بچۆ بەلای

کاسبی خۆتەوە. کابرا ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو.

هەموو ڕۆژێ لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا ئەهات. من چۆنم پێی وتبوو بەو جۆرە ڕایئەبوارد. منیش وەختەکەم لەگەڵا بە قسە کردن ڕائەبوارد. ڕۆژێك زۆر گەرمابوو، من دەستم کرد بە دەردەدڵ کردن کە ئەم گەرمایە چییە؟ ئەویش وتی:

قوربان ئەوە ئەم گەرمایە هی ئەوەیە کە وەختی خۆی خواوەنتەعالا ویستی جەحەنەم لێرە دروست بکا ـ لەم شارە ـ هێنای لە پێشا توونەکەی دروست کرد، لە پاشا ئەولیاکان و شێخی «سراج الدین» لێی کۆ بوونەوە، عەرزیان کرد: بینایی چاوان تۆ لێرە جەحەنەم دروست ئەکەی لەوانەیە عەرەبەکان تێکومەکانی بدەن و بە جارێ وێرانی بکەن. بێنە بیگوێزەرەوە بۆ شوێنێکی‌تر.

ئەویش کە ئەمەی گوێ لێبوو لە ترسا بە خۆی و کەرەستەی جەحەنەمەکەیەوە هەڵات. بەڵام توونەکەی لەبەر شپرزەیی لێ بەجێ ما. جا ئێستە ئەم گەرمایە هی ئەوەیە.

وتی: لە پاش چەند ڕۆژێك کابرا پێی وتم: قوربان من بۆچی هەموو ڕۆژێ بێم بۆ ئێرە؟ بۆم حساب بکە ڕۆژی چوار فەیسەڵی حەفتە و حەفتە دێم پارەی هەموو حەفتەکەم بدەرێ، ئیتر بۆچ هەموو ڕۆژێ بێم؛ ئەچم بۆ خۆم کاسبییەك ئەکەم.

وتی: بەڕاستی بیروباوەڕی کابرام بەلاوە سەیر بوو. وتم: برا بۆچی تۆ چی ئەکەی بۆ من؟ هیچ وائەزانی گوێزی هەورامانم بۆ ئەژمێری؟ من وتم: با لەو بەر هەتاوە نەمێنیتەوە؛ کەواتە خوات لەگەڵ.

١٤٨. لەو وڵاتی موکریانە پیاوێکی جۆڵا هەبوو «مامەویس»ی ناو بوو. ئەم مامەویسە گەلێ جاری وا هەبوو لە بەنەمەرەزی خۆی

-واتە بەن لە خۆی- ڕانکوچۆخەی بۆ خەڵك ئەکرد و پیانی ئەفرۆشت. پیاوێکی‌تریش هەبوو مام حەیدەری ناو بوو، بزنە مەرەزی چاکی هەبوو. ژنێکیش هەر لە وڵاتەکەدا بوو پوورە ئەسمەریان پێ ئەوت. تەشی ڕێسی ئەکرد؛ بەڵام تەشی‌ڕێسێ چاك بوو. مام حەیدەر عومری هەشتا ساڵ بوو، پوورە ئەسمەر نەوەد، مام وەیسیش تەنگی بە سەد هەڵچنیبوو.

هەر لەوێدا «حەمەد بابەکر»ێك هەبوو دەوڵەمەند و خاوەن جووت و گا بوو. هەموو ساڵێ سەپانی ڕائەگرت. لەو وڵاتەدا وەکوو نان ئەدەن بە سەپان، بەرگیشی ئەدەنێ. ئەم حەمەد بابەکرە سەپانێکی ڕاگرت. بڕیار ئەوەبوو ڕانکوچۆخەشی بۆ بکا، بەڵام هەر بۆی نەکرد و هەر ئەیوت: با مام حەیدەر مەرەزە چاکەکەی ببڕێتەوە ئەیدەم بە پوورەئەسمەر جوان بیرڕێسی، ئەو وەختە مام وەیس بە دڵ بۆت بکا بە ڕانکوچۆخە. هەر بەم جۆرە سەپانەکەی لە بەهارەوە ئەخستە پاییز و لە پایزەوە ئەیخستە بەهار. لە ئەنجاما سەپان وەڕز بوو وتی:

مەرەز مەرەزی مام حەیدەر بێ
تەشی ڕێسەکەی پوورە ئەسمەر بێ
جۆلاکەی مام وەیس سەرقنگ عەنتەر بێ
ئەم ڕانکوچۆخە قەت تەواو نابێ

١٤٩. کابرایەکی خۆشناو گوێدرێژێك بار ئەکا لە ترێ و ئەیباتە مەخموور بۆ فرۆشتن. ترێ ئەگۆڕێتەوە بە گەنم و بار دائەگرێ بۆ گەڕانەوە. گەنمەکە گران و قورس ئەبێ کەرەکە نایتوانێ؛ لەبەر ئەوە کەر لە شوێنی خۆی ناجووڵێ. کابرا کەر بە بارەوە دائەگرێ بە لێدان. خەڵکەکەش لەوێ دانیشتوون سەیر ئەکەن ئەم کابرایە زۆری دا لەم

کەرە بەستەزمانە؛ ئەوانیش دێن تێروپڕ ئەدەن لە کابرا. هەندێ لە باری کەرەکە کەم ئەکەنەوە و ئەیدەن بە کۆڵی کابرا خۆیا ئەڵێن: دە ئێستە بۆ خۆت بڕۆ ملت بشکێنە. کەر کە بارەکەی تۆزێ سووك ئەبێتەوە ئیتر ئەڕوا. جا کابرا کە لە گوتدەکە دەرچوو سەری نابووە بنا گوێی کەرەکەوە پێی ئەوت: «هەنووکە چ دەرێیت؟ ما لێرەش خزموو هەنە؟!».

**١٥٠.** کابرایەکی شارەزووری تەلاقی ئەکەوێ و ئەکەوێتە شوێن تەلاقەکەی بۆ چاك کردنەوەی. مەلا مەحموو گێڕایەوە وتی: ئەم کابرایە ئەچێتە سولەیمانی، ئەچێتە لای مەلاعەبدوڵڵای چوڕستانی و پێی ئەڵێ: قوربان تەلاقێکی پیسم خواردگە و لە ڕووم هەڵنایە بیگێڕمەوە. ئەویش ئەڵێ: باوکم، بیڵێ بزانم چیت وتووە؟ ئەڵێ: ئاخر قوربان لە ڕووم هەڵنایە بیگێڕمەوە.

ئەویش ئەڵێ: باوکم، لە شەرعا شەرمی بۆ نییە، بیگێڕەوە بزانم چیت وتووە، بەڵکوو چارێکی بکەین. کابراش هەندێ سەر دائەخا و پاشان ئەڵێ:

وەڵڵا قوربان وتم وەژنەکەم: تەلاقت کەوتووێ هەر مەلایەکیش خاسی کاتەوە بکەم وە قوزی دایکیەوە!.

مەلا عەبدوڵڵاش سۆفی سەر ئەبێ، ئەم جۆرە قسانەی قەت گوێ لێ نەبووە، بە تەوسێکەوە سەیرێکی کابرا ئەکا و بە دەستی ئیشارەی بۆ ئەکا و ئەڵێ: هەستە بڕۆ، هەستە.

کابرا دێتە دەرەوە لە خەڵکوخوا ئەپرسێ ئەڵێ: بەڵکوو مەلایەکم پیشان دەن تەلاقەکەم خاس کاتەوە. خەڵك مەلا عەولای بێژوێ لە مزگەوتی گەورەی پیشان ئەدەن. ئەم مەلا عەولایە لەو ڕۆژەوە کە هاتۆتە دنیاوە تا

ئەو تەمەنی هەشتاوپێنج سالّییە وەکوو شێخ ئەمینی بێژوێ هەر سۆفی و هەر دوورەپەرێز لە دنیا بووە.

ئەچێتە خزمەتی و ئەلّێ: قوربان تەلاقێکی پیسم خواردگە، بریا گووم بخواردایە و تەلاقی وام نەخواردایە. چوومە خزمەتی ئەو مەلایە دەری کردم، ئێستە جەناوتیان پیشان داگم. هاتگم جا تۆیش کەیفی خۆتە. لە ڕووشم هەلّنایە بیگێڕمەوە. ئەویش وەکوو چوڕستانی ئەلّێ: بابم، دە بیلّێ، دە شەرعی شەریفدا چ شەرمی تێدا نییە.

کابرا ئەلّێ: قوروان وتم وە ژنەکەم: تەلاقت کەوتووێ و هەر مەلایەکیش خاسی کاتەوە بکەم وە قوزی دایکیەوە. مەلا عەولّا بە تەواوی ئاگری تێ بەر ئەبێ ئەلّێ:

بابم من تەلاق و وانێك چاك ناکەمەوە، ئەگەر چاکم بکردایەتەوە چاکم ئەکردەوە. ئەوجا من لە قوزی دایەلێ تۆم ئەبرد و لە قوونی بابیشت. دە هەستە بڕۆ دەبەنگ!.

١٥١. شێخ مەحموودی مەلیك لە دەورەی سولەیمانی بوو. شەڕی لەگەلّ ئینگلیز و حوکمەتی عێراقدا ئەکرد. گەلێ لە زابتە کوردەکانی لەگەلا بوو؛ یەکێك لەوانە «عیززەت تۆپچی» بوو. سەردەمێك لە بناری تەلان و جاسەنە بوون.

شێخ ئەمری دابوو هەموو شەوێکی جومعە زیکر بکەن. ئەو عالەمە ئەبوایە بچوونایە کۆڕی ئەو زیکرەوە. زابتەکان لەبەر ئەوەی کە لە خەلّکی تر نزیکتر بوون بە شێخەوە، ئەوان بەولاترەوە ئەبوایە لە زیکرەکە بوونایە. لەمانەش زۆریان هەبوو کە بڕوایان بەم زیکر و هەراوهوریایە نەبوو، بەلام زۆری شێخ مەحموود ڕاپێچی دابوون. زیکرەکەش زیاتر لەسەر وشەی

«الله» ئەبڕایەوە. ئەبوایە پێنج تەزبێح «الله» بکرایە. عیززەت تۆپچیش تووشی ئەم زیکرە بووبوو، بەڵام ئەو زیکرە کوجا مەرحەبا.

چەند شەوێك بەم جۆرە تێپەڕی و عیززەت لە وزەیا نەما. شەوێك لە کۆڕەکەدا بانگی کرد یا شێخ! شێخ مەحموودیش وتی: بەڵێ. عیززەت وتی: هیچ. تۆزێکی‌تری پێ چوو دیسان بانگی کرد یا شێخ! ئەویش ئەیوت: بەڵێ. ئەم ئەیوت: هیچ. بەم جۆرە عیززەت تا چوار جار بانگی ئەکرد یا شێخ. شێخ تووڕە بوو وتی: سەگی سەگ‌جسن بۆچ من گاڵتەچی تۆم! هەر بانگم ئەکەیت و پاشان ئەڵێی: هیچ؟ عیززەت وتی:

«قوربان! تۆ بە چوار جار بانگ کردن وا تووڕە بوویت و بەو جۆرە دەستت کرد بە ئاگر کردنەوە. ئەی خوا ئێمە پێنجسەد جار بانگی بکەین و هەر بڵێین "الله الله" ئاخر ناڵێ سەگی سەگبابینە چیتان لێم ئەوێ وا لەسەریەك لەسەریەك وەکوو جیکەنە بانگم ئەکەن و هیچ ئیشێکیشتان نییە؟»

شێخ مەحموود وتی: ئەی بەلەحنەت بی بۆ خۆت و بۆ قسەت. بڕۆ نەگبەت ئیتر جارێکی‌کە مەیەرە کۆڕی ئەم زیکرەوە. عیززەت بەم‌جۆرە خۆی لە دەست زیکر کردن ڕزگار کرد.

**١٥٢.** دوکتۆر ئەمین گێڕایەوە وتی: «سابری تەپەجنە» هەبوو، پیاوێکی پیری قسەخۆش بوو. زۆربەی ژیانەکەی لە پۆلیسیدا بەسەر بردبوو. کە لە پۆلیسی دەرچووبوو، بە تەواوی قسەی خۆش کردبوو وتی:

ئەوا لە بەرزنجەم لە بەردەرگای مودیرام. مودیریش ڕەشیەفەنی بوو. ژنێکی جوانکەلە (خوا هەقە زۆر جوان بوو) پەلی مێردەکەی ڕاکێشابوو، هاتن بۆ لای مودیر، ئەیەویست تەڵاقی خۆی لێ بستێنێ. وا دیار بوو

پێشووتر چووبوون بۆلای مەلا. کابرا ژنەکەی تەڵاق نەئەدا و دیارە مەلاش بۆی تەڵاق نادا. ناچاری هێنابووی بۆلای مودیر.

مودیر بە پیاوەکەی وت: کابرا تۆ ئەم ژنەی خۆت تەڵاق ئەدەی؟ کابراش وتی: قوربان تەڵاقی نادەم. خۆ بە زۆر پێم تەڵاق نادەن. ڕووی کردە ژنەکە وتی: ئافرەت وا ئەڵێ تەڵاقی نادەم. ژنە تووڕە بوو ڕووی کردە مێردەکەی و وتی: «دەم گەناوەی سیسەڵە! قوزی خۆمە و نایدەم وە تۆ ئەو قوزە سەگە». سابر وتی: چوومە لایەوە پێم وت: بەقوربانی ئەو قوزە بم! وتی: ژنەکە وتی: خوا عافووت کا.

**١٥٣.** دوکتۆر کاوس قەفتان گێڕایەوە وتی: پوورم بۆی گێڕامەوە وتی: ئەوا ڕۆژێك لە ماڵەوە هەموو دانیشتووین، دەرگای حەوشەکە کرابووەوە. ئەوەندەمان زانی پیاوێك بە هەڵەداوان کردی بە دەرگاکەدا و هاتە حەوشەوە. بە بڕسکاوی پرسی: ئەرێ پێشاوەکە لە کوێیە؟ ئێمەش وا تێگەیشتین کە ئەم کابرایە تەنگاوە و ماڵەکەی بە مزگەوت زانیوە، ئاودەستەکەمان پێشان دا، خێرا سەری کرد بە ئاودەستەکەدا. ئەوا ئێمەش چاومان لێیە دەستی برد بە سەری پەنجەیەکی تۆزێ پیسایی دەرهێنا! خستیە سەر پەڕۆیەك و هاتە دەرەوە وتی: ماڵتان ئاوابێ و ڕووی کردە قاپی حەوشە بۆ ڕۆیشتن. ئێمەش ئەمەمان زۆر بەلاوە سەیر بوو لێمان پرسی: خاڵە تۆ ئەمە چیت کرد و بۆچ وات کرد؟

وتی: «برا بێژم چی؟ نەخۆشم چوومە لای ئەو حەکیمەی دراوسێتان، موعایەنەی کردم وتی: بچۆ تۆزێ لە پیساییەکەت بێرا تا تەحلیلی بکەم. منیش بێژم چی گووم نایە هاتم بە پەلە ئەمەی بۆ ئەبەم بزانم دواجار چی ئێژێ؟».

وتی: ئێمەش وتمان: دەی جا باوکم ئەمە چۆن ئەبێ؟ ئەو داوای هی خۆتی کردووە. ئەویش وتی: برا ئەمە ئێوە ئێژن چی؟ گوو هەر گووە! هی من وێ و هی یەکێکی‌تر وێ بۆ ئەو هەر خاسە. ئەمەی وت و بە فڕکان لە دەرگا دەرچوو، بە نیازی خۆی بۆلای دوکتۆر!.

.١٥٤ لەو دەشتی دزەییە کابرایەك پەڵەقەرسیلێکی هەبوو چوار پێنج کار پێی فێر بووبوون، ئەچوون ئەیانخوارد. کابرا هەر دەری‌ئەکردن و ئەوان هەر ئەهاتنەوە. یەکێ لە کارەکان پەلێك بوو سەری سپی بوو. کابرا گەیشتە تینی، ڕاوی نان و کارەپەلەکەی گرت بە دار هاتە ویزەی و وتی: «هەی سەگی سەگبابی لە سەی بوو! ئەوە ئەوان سەریان ڕەشە و لە هیچ تێ ناگەن خۆ تۆ سەرت سپییە. ئاخر نابێ تۆزێ شەرم لەو مووە سپییەی سەرت بکەی؟ ئەوا چەند جارە من دەرتان دەکەم. لەباتی ئەوە تۆ پێیان برێیت دە حەیبە ئێتر با نەچینەوە، کەچی خۆت پێشیان دەکەوی و دەیانهێنیتەوە. دە بڕۆ بیخۆ لۆ خۆت!.

.١٥٥ ڕەشید جەودەت جارێك لەو وڵاتی بەسرەیە شەوێك لەگەڵ خانمێکی ئەو ناوەدا ئەبێ، پاش ماوەیەك بەدەم گەمەوگاڵتەوە دەستێك ئەدا لە سکی خۆی و ئەڵێ: «**شوفي هذا بَطني**». خانم پێی ئەڵێ: مەڵێ: «**هذا بَطني**» بڵێ: «**هذِهِ بطني**». ئەویش ئەڵێ: بۆچی وا بڵێم؟ ئەڵێ: چونکە «بَطن»، «مُؤنَّث»ـە. ئەمیش هیچ دەنگ ناکا. پاش ماوەیەکی‌تر هەر بەدەم گەمەوگاڵتەوە دەستی ئەخاتە سەر مەوزعی کاری خانم: «**هذِهِ فَرْج**». خانم ئەڵێ: مەڵێ «**هذِهِ فَرْج**» بڵێ «**هذا فَرْج**». ئەڵێ: بۆچی؟ ئەڵێ: چونکە «فرج» «مُذَكَّر»ە. ئیتر لە وزەیا نامێنێ ئەڵێ: هەی سەگی سەگبابی دێڵەسەگ! ئەو قوزە پیسەی تۆ کە تا ئێستە چوار

هەزار کێری خواردووە، نێر بێ و ئەم سکەی من بەم پاك و پوختییە مێ بێ. ئەمە تا ئێستە نەبووە و نەبیستراوە. هەستە بچۆ بەولاوە «بەڵا»م لە خۆت و لە زمانیشت دا.

١٥٦. شێخ «نجم‌الدین» گێڕایەوە وتی: بەکراغای گەورك عەمری خوای کردبوو. کوڕێکی هەبوو کوڕەکەیان لە جێگای دانابوو. ئەم کوڕە زۆر جرت و فرت و هیچ بوو. شێت نەبوو، بەڵام وەکوو شێت وا بوو. خزمەتکارێکی باوکی هەبوو کە پیاوێکی زۆر ژیر و دانا بوو، هەموو جار ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەکرد: کەوا جرت و فرت نەبێ و تۆزێ گران و سەنگین بێ، بۆ ئەوە خەڵکەکە شەرمی لێ بکەن و شوێن ئاگردان کوێر نەبێتەوە. لە دوایی هەموو شتێکا کوڕە هاتە قسە و وتی:

بابەلێ بابەلێ! بەخودای لووتەی ئەحمەد شۆخێ ببەستی بە گونمەوە تازە گران و سەنگین نابم. (ئەحمەدشۆخێ: شاخێکە لە بەشی گەورکی ئێران بەلای شیمالی سەردەشتەوە).

١٥٧. مەلا عەلی قەشانی گێڕایەوە: ژنێك هەبوو لە قەشان شێت بووبوو، خەڵکی پێیان ئەوت: کێرمان بە قوزت. ئەویش ئەیوت: جا تولّە بابینە! قوزم بە کێرتان!.

١٥٨. جارێك لە هەولێر مناڵە ئاغاکان کابرایەکی کرمانج ـکە سمایلی ناو بووـ ئەیبەن عەرەقی ئەدەنێ. شەوێك سەرخۆش ئەبێ، ئەمجا ئەچنەوە لە قەڵاتێ ئەو شەوە ئەنون. بەیانی کابرا کە هەڵئەستێ تینوی ئەبێ، سەیر ئەکا شەربەیەك لەسەر بانەکە دانراوە. دانیشتووەکانی قەڵات هەر لە ئێوارەوە شەربەئاو لەسەر ئەو بانە بەرزانە دائەنێن تا

بەیانی ئەبێ بە تەرزە. سمایل شەربەئاوەکە ئەنێ بە سەرەوە تەماشا ئەکا تا ئەو وەختە ئاوی سارد و بەلەزەتی وای نەخواردۆتەوە ئەڵێ:

ئای لە قونێتان بم هەولێرییان! هەنووکە زانیم کە لۆچی حەرەقان دەخۆنەوە.

١٥٩. شێخ «عبدالرّحمن» گێڕایەوە وتی: مەلا ساڵحی کۆزەپانکە و مەلا سمایلی دێبەگە و چەند کەسێکی‌تر-کە یەکێك لەوانە مام عەزیز بوو-ڕۆژێك لە دێبەگە بەناو کۆڵانێکا ئەڕۆن. بەلای دیوارێکا تێ‌ئەپەڕن دیوارەکە زۆر بەرز نابێ؛ بە حاڵ سەریان لەو دیوی دیوارەکە دیار ئەبێ. دیوارەکەش دیواری حەوشەیەك ئەبێ. منالێك لەو دیوی دیوارەکەوە هەر ئەگری و دایکەکەی بۆی ژێر ناکرێتەوە، مام عەزیز سەر بەسەر دیوارەکەدا شۆڕ ئەکاتەوە و بە دایکی منالەکە ئەڵێ: دایکم، ئەو منالەت بۆ ئەوەندە ئەگری؟ هەڵبەت «بسم الله»ی لێ نەکراوە.

ژنەش چاوی لە مەلا ساڵح و ئەوان نەبوو وتی: برام «بسم اللّٰه»ی چی لێ نەکراوە؟ مندالەکانی مامۆستا مەلا سمایل ئەعوزووبیللاشیان لێ کراوە، کەچی هەر دەست بە دەمی سەیدا ئەکەن!.

١٦٠. لە سولەیمانی لە گەڕەکی هۆلێ، ساڵح‌ئاغا هەبوو. مزگەوتی گەڕەکەکە تێك چووبوو، خەڵکی گەڕەکەکە ئەیانویست چاکی کەنەوە. ئەچنە لای ساڵح‌ئاغا پێی ئەڵێن: ئەمانەوێ مزگەوتەکە تێك‌بدەین و چاکی کەینەوە، جەنابیشت ئەگەر بەشی خۆتی تێ‌خەی زۆر خێرت ئەگا. ئەویش ئەڵێ:

من بۆ تێکدانەکەی چیتان ئەوێ ئەتاندەمێ، بەلام بۆ چاککردنەوەکەی یەك پوول نادەم!.

١٦١. حەسەن ئەفەندی هەبوو لە سولەیمانی هەموو جار لە دوعای پاش نوێژی جەماعەتا ئەیوت: بێجگە لەو دە دوانزە کەسەی کە خۆم ئەیانزانم فاتیحە بۆ ڕۆحیانەتی هەموو موسوڵمانان بێت!.

١٦٢. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: مەلا جەلالی مەلا حەسەنی ئابڵاخ ڕۆژێك لە بازاڕ مریشکێکی زیندوو ئەکڕێ، ئەیخاتە ژێر جوبەکەی و ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵەوە لە بیری ئەچێ مریشکەکە دانێ، دائەنیشێ و هەر بە جوبەکەیەوە خۆی ئەخا بە لادا و ئەکەوێ بەسەر مریشکەکەدا. مریشك دەست ئەکا بە قیژوهۆڕ. مەلا جەلال ئەترسێ و هەڵئەستێ و ڕائەکا ئەڵێ:

خەڵکینە بمگەنێ دەعبایەك لە ژێر جوبەکەمایە خەریکە بمخوا!.

١٦٣. ئاڵتوون ئەفەندی هەبوو لە سولەیمانی، لێیان پرسی: ئاڵتوون ئەفەندی «**و ماءُ الوَرد و الشَّجَر الطَّهور**»؛ مەعنای چییە؟ ئەویش ئەڵێ: ئەو کۆترەی لەسەر بەردە باڵی لێ پەیدا ئەبێ و پاشان ئەفڕێ.

١٦٤. شێخ بەشیر ئەترووشی بۆی گێڕامەوە وتی: لەو وڵاتە ئاغا شڕە زۆرە. کابرایەکی حەیرانبێژ، بە ناوبانگی ئاغایەکەوە ئەچێت و شەوێ ئەبێ بە میوانی، بۆ ئەوە شتێکی بداتێ. لە گوێ ئاگردان دائەنیشن و «حەیران»ـێکی بۆ ئەڵێ. ئاغا ئەڵێ: مەڕێکی بدەنێ. ئەمجا «خەزێم»ـێك ئەڵێ. ئاغا ئەڵێ: گایەکی بدەنێ.

بەم جۆرە هەر ئەو گۆرانییەك ئەڵێ و ئاغاش هەر بۆی زیاد ئەکا. هەتا بەیانی ڕۆژ ئەبێتەوە. کابرا بەیانی ئیتر ئەیەوێ بڕوا سەیر ئەکا هیچ

دیار نییە. ئەچێتە لای ئاغا ئەڵێ: ئەمەوێ بچم بۆ لایەکی‌تر، خەڵاتەکەم بدەرێ با بڕۆم. ئەڵێ: خەڵاتی چی؟ ئەڵێ: ئەوانەی کە شەوێ فەرمووت. ئاغاش ئەڵێ: تۆ چاکت وت و منیش چاکم وت!. کابرا بە هەناسەساردی ئیتر لێ ئەدا ئەڕوا!.

**١٦٥.** فەقێ محەمەدی نانەوا هەبوو لە بیارە نانەوای خانەقای بیارە بوو. لە دەمەدەمی پیریدا شێخ عەلائەددینی بیارە ژنێکی بێوەژنی بۆ هێنابوو.

لە هاوینانا فەقێ محەمەد ئەچووە سەر ئاوەکەی شێخ مووسا بۆ مەلە کردن و وسڵ دەرکردن. کە خۆی ئەژەند بە ئاوەکەدا ئەیوت: یاڕەبی بەقوربانت بم شێخ عەلائەدین خوا عافووت بکا. زستانان کە ئەچوو مەلە بکا کاتێ کە خۆی لە ئاوەکە هەڵئەکێشا ئاوی سارد و شەختە ئەیوت: نیەتمە گووم خوارد. خوا بتگرێ شێخ عەلائەددین بۆ پەنێ پێت دام.

**١٦٦.** کابرایەك لەو وڵاتی دزەییایەتییە ژنێکی هەبوو هەر لەگەڵ هەر شتێك ئەبوو کابرا بە ژنەکەی ئەوت بیلێم. ژنەش لەبەر بیلێم بیلێمی مێردەکەی زۆر ئەسڵەمییەوە و لەوانەبوو پاشەڵیشی وا دیار بوو پیس بوو. ئەیوت: ببێ و نەبێ ئەبێ بە شتێکی زانیبێ بۆیە وا هەموو جار وا ئەڵێ.

ئاخری وای لێ هات کوناوەجەرگ بوو. ڕۆژێك لە وزەیا نەما وتی: دە بیلێ بزانم ئەمە چییە هەر ئەڵێیت بیلێم؟ کابرا ئەمجا وتی: دەسا وەڵڵا ئەیلێم، ئەمنت بمرم.

ئەمجا ژنە وتی: دەك بەزیاد نەبێ ئەمە بوو بۆ ئەمە چەند ساڵە منت پێوە کوشتووە ئەمری نامری جاڕوجەحەنەم.

**١٦٧.** تازە پاقلاوا و ماقلاوا داهاتبوو کابرایەکی جافی کۆچەری جارێك لە ماڵی مەحمووپاشادا خواردبووی زۆر بەلایەوە بە لەزەت بوو.

ئەم کابرایە ئەچێ بۆ سولەیمانی سەیر ئەکا وا لە دوکانێك ئەوەی لە دیواخانەکەی محمووپاشادا خواردوویە هەیە و کابرایەکیش وشك لەناو دووکانەکە بە سەریەوە ڕاوەستاوە. ئەمیش لە بەرانبەریەوە هەر ئەوەستێ. سەیر ئەکا کابرای ناو دووکان هیچ جووڵە ناکا، ئەچێتە پێشەوە بۆی. دوو پەنجە ڕووبەڕووی هەردوو چاوی ئەکاتەوە. کابرا سەری ئەکێشێتەوە دواوە ئەڵێ: ئەوە بۆچ وائەکەی؟ ئەڵێ: برا ئەوە بۆچی چاوت ئەوینێ؟ ئەڵێ: بۆچ نابینێ. ئەڵێ: ئەگەر ئەوینێ ئەوە بۆچی تێر و پڕی لێ ناخۆی؟.

**١٦٨.** پێکوڕەیەکی جاف لە عێل بەجێ مابوو، لە کاتی گەڕانەوەیانا بۆ گەرمیان لە شاربازێڕ لەو بناری «شووکێ» و «باراو»ەدا دەوار هەڵئەدەن. ترێ پێ گەیشتووە، ماڵەکە مرخ لە ڕەزێك خۆش ئەکەن. شەوێك ئەچن چی بە ڕەزەکەوەیە لێی ئەکەنەوە و ئەیهێنن بۆ ئەوە سبەینێ بیخەنە سەر پشتی گایەك و بچن بە ڕێی خۆیانەوە.

لە دەمەو هەتاوکەوتنا خاوەن ڕەز ئەچێتە سەر ڕەز تەماشا ئەکا یەك هێشوەترێ چییە پێوە نەماوە. دەنگی دەرودراوسێ ئەکا ئەڵێ: غەوارە لەم شوێنەدا نییە، تەنها ئەو ماڵە جافە تەریدەیە نەبێ کە یەك دوو ڕۆژە لێرەدا خستوویانە. ئەم ئیشە ئیشی ئەوانە. دەی با بچین.

هەر یەکە پەلاماری تێلایەك ئەدەن و هێرش ئەبەنە سەر ماڵەکە. ماڵیش کەسیان لە عەشرەت لا نییە. سەیر ئەکەن ئەو حەشاماتە کە هات ئێستە هەر بە خواردن ئەیانخۆن. چاریان نامێنێ دێنن بە پەلە بارەترێ بە درێژی دائەنێن، مەوجێك ئەدەن بە سەریا و ئەکەونە شین

و شەپۆڕ بە دەوریا و ئەڵێن:

| | |
|---|---|
| تورش و شیرینە براڕۆ | مزر و شیرینە براڕۆ |
| خاوەن نەوینە براڕۆ | دۆشاو ڕەنگینە براڕۆ |
| باسوق سنجاقە براڕۆ | دەرمانی قورگە براڕۆ |
| جێگای حەو برای تۆ براڕۆ | دەنگت دەرنایە براڕۆ |
| وا دەوریان داگین براڕۆ | شان هەڵتەکێنە براڕۆ |
| بۆچی وا ماتی براڕۆ | کاسەی نەباتی براڕۆ |

دەستەی تێڵا بەدەست کە دێن و ئەزانن وا ئەمانە کۆستیان کەوتووە و مردوویان لێ مردووە! بە شوێنەکەی خۆیانا ئەگەڕێنەوە، ئەڵێن: دزی ئێمە ئەمانە نین. پاش چوونی ئەوان ئەمانیش بار ئەکەن و ئەڕۆن و هۆڕەترێش بەبێ قڕە لەگەڵ خۆیان ئەبەن.

١٦٩. حاجی مستەفای پاشای یامڵکی لە نەخۆشی مردنیا لە خەستەخانەی مەجیدیە بوو لە بەغدا. ڕۆژێك دەست ئەکا بە گریان و خوڕخوڕ ئاو دێتە خوارەوە بە چاویا. پێی ئەڵێن: پاشا خوا شفات ئەدا و دەرئەچی، بۆچ وا بێتاقەتی ئەکەی؟ ئەوە وا نییە هەرکە نەخۆش بکەوێ بمرێ. ئەویش ئەڵێ:

ئەوە ئێوە ئەڵێن چی؟ من بۆ ئەوە ناگریم کە ئەمرم؛ ئەمرم بە گونی بارگیرتانەوە. بۆ ئەوە ئەگریم تا ئەو وەختە من، من بووم، ئەم ناسك و نازدارانە لە کوێ بوون؟ ئێستە کە من هیچم پێ نەماوە چۆن ئەم فریشتانە وەکوو پەپوولە بە دەورما ئەسووڕێنەوە! من بۆ ئەمە ئەگریم. (مەبەستی سیستەرەکان بوو).

**١٧٠.** حەمەی باجیایشێ هەبوو تەلاقی خواردبوو سێبەسێ کە جگەرە نەکێشێ. چەند ساڵێکی پێ چووبوو بەم جۆرە مابووەوە. هەر وەختە بوو ڕۆحی دەرچێ بۆ جگەرە. لەبەر تەلاقەکەش نەیئەتوانی جگەرە بکێشێ.

ڕۆژێك لە ناکاو خەبەریان بۆ هێنا کە ژنەکەت مرد. ئەویش کە ئەم خەبەرەی بیست بەبێ ئیختیار هەر هەستا و دەستی کرد بە سەماکردن و ئەیوت: ئۆخەی ئۆخەی جگەرەم بەنێ، کاری خۆڵایە جگەرەم بەنێ. حەمەی ئایشێ جگەرە بکێشە، بۆ سوێندت خوارد؟ جگەرە بکێشە. ئەو گووەی خوارت نەیخۆیتەوە! لە بەهەشتیشا نەیکەیتەوە!.

**١٧١.** لەو کوردەوارییە باوە کە نوێژی جەژن کرا خەڵکەکە ئەچن بۆ ماڵان بۆ جەژنەپیرۆزە. لە گوندی «شوێ» لەو وڵاتی بانەیە پاش ئەوە جەماعەت نوێژی جەژن ئەکەن، مەلاکەیان پێشیان ئەکەوێ و ئەچن بۆ ماڵەکان بۆ جەژنەپیرۆزە. کە ئەچنە هەر ماڵێکیش شتێك هەر ئەخۆن، هی واشیان تێدا ئەبێ هیچ ناخوا. بەڵام مەلا بەلایەوە «سوننەتە» لە هەموو ماڵەکان شت بخوا. وای لێ دێ ئیتر ناتوانێ بە پێیان بڕوا. کەرێکی بۆ دێنن سواری کەرە ئەبێت و پێش خەڵکەکە ئەکەوێ. ئەمجا وای لێ دێ ئیتر ناتوانی داشبەزێ. هەر بەسەر گوێدرێژەکەوە پیرۆزبایی ئەکا. شتێکیان کە هێنا هەر بەسەر کەرەکەوە پاروویەکی لێ ئەخوا و ئەڵێ: بەزیادی کەن.

لە ئاخرا ماڵی پیرێژنێك ئەمێنێ، ئەچن بۆ ئەوێش، بەبێ دابەزین لە بەردەرگاکە پیرۆزبایی ئەکا و ئەڕوا. جەماعەتیش بە شوێنیەوەن. لەوەش ئەکەوێ هەر لەسەر کەرەکە شت بخوا. پیرێژنە دێت بەردەمی ئەگرێ و ئەڵێ: بەقوربانت بم! شیرەوامان هەیە ئەبێ بۆ پیرۆزی پارووییەك

هەر بخۆیت. مەلاش ئەڵێ:

سەری کەرەکە بگێڕنەوە، شیرەوا سووکە!.

١٧٢. خاڵە ڕەجەب هەبوو لە سولەیمانی بە شەو درەنگ ئەچووەوە بۆ ماڵەوە. قاپی حەوشەکەیان هەردوو دیواری ئەملاوئەولای کەوتبوو. ئەو لەوێوە نەئەچووە ژوورەوە تەقوهۆڕ ئەیدا لە قاپی، بەو درەنگ‌وەختە ماڵ و منالی هەڵئەساند بێن قاپی بۆ بکەنەوە. دایکی شەوێك پێی ئەڵێ: هەتیو تۆ بۆ بەو دیوارە ڕووخاوەدا نایتە ژوورەوە کە حوشتری بەبارە تەنگزەوە پیا دێت؟ ئەم تەقوهۆڕەت لە چییە؟ هەموو شەوێ بەم نیوەشەوە ئێمە هەڵئەستێنی و خەوت لێ حەرام کردوین. ئەویش ئەڵێ:

دایە وس! دەنگ مەکە! من بۆیە لێرەوە دێمەوە با دز وا نەزانێ ئێمە دەرگامان نییە! ئەگەر لەولاوە بێمە ژوورەوە ئەویش فێر ئەبێ لەوێوە دێت، هەر شتێکمان هەیە ئەیدزێ!.

١٧٣. گورگ لەو کوردەوارییە زۆر هەبوو، زیانێکی زۆری بە ماڵات ئەگەیاند. جا مەلای گوند ئەیهێنا بە چەقۆیەك دەمی گورگی ئەبەست. ئەویش بەو جۆرە: کە چەقۆیەکی ئەگرت بە دەستەوە چەند ئایەت و دوعایەکی ئەخوێند بەسەر چەقۆکەدا، فووی لێ ئەکرد و پێکیەوەی ئەنووساند و ئەیدایەوە دەست ئەو کەسە کە بۆی هێنابوو ئەیوت: بیبەوە لە ماڵەوە داینێ تا ئەو چەقوە نەکرێتەوە دەمی گورگەکە بەڕەڵا نابێ.

مەلا فەتاحی گرتك هەبوو ڕۆژێ پیرێژنێك چەقۆیەکی لێ وەرئەگرێ و بەم جۆرەی خوارەوە دەمی گورگی بۆ ئەبەستێ.

﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾، هەشت نۆ چین ها ها ها ﴿وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا﴾، ها دایکم بگرە دەعباها، گورگە نەکەی بزناها، بیگری و بیکەی قوتاها!.

١٧٤. لە گوندی «گردەسۆر» لە وڵاتی هەولێر باو وا بوو کە میوان روویان ئەکردە ئەوێ یەکێ لە خەڵکی گوندەکە بە سەرە نانی بۆ ئەو میوانە دروست ئەکرد.

ڕۆژێک دەستەیەك لە گوندێکی ترەوە لەگەڵ کوێخادا بە میوانی چوونە گردەسۆر. ئەو ڕۆژە مەلای گوندێ وتی: ئیمڕۆ نۆبەی منە و ئەبێ من نانیان بۆ دروست کەم. چووە ماڵەوە ڕایسپارد. ئەهلی گردەسۆریش وا پشتەسوور بوون کە مەلا نان دروست ئەکا.

ئێوارە نوێژی شێوان کرا لە مزگەوت میوان هەموو بە مەلا فەتاحەوە چوونەوە بۆ ماڵەوە. مەلا کە ئەچێتە ژوورەوە سەیر ئەکا مەلاژن هیچی نەکردووە. مەلا فەتاح دێتەوە دەرەوە، لاقێکی ئەخاتە ئەم لای قاپییەکە و لاقێکی ئەخاتە ئەولای ئەڵێ: کوێخا چارێکی خۆتان بکەن مەلاژن هیچی نەکردووە!.

١٧٥. شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی بۆی گێڕامەوە وتی: لەو وڵاتی باڵەکایەتییە لە گوندی «بیتواتە» مام تەها هەبوو هەر خەریکی ئیش و کاری لادێ بوو؛ وەکوو ڕەز و باخ و جووت و گا. ژنێکی هەبوو ئەویش خەریکی تووتن و مەڕدۆشین و نان و هەویر بوو. هەموو عومریان بەم جۆرە پێکەوە ڕابواردبوو.

ڕۆژێک مام تەها سەیری کرد وا ژنەکەی بارێکی بارکردووە و بە هەچە هەچە کەوتۆتە شوێنی. لێی پرسی: ئافرەت ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟

وتی: وەڵڵا پیاوەکە ئەچم بۆ سەر ئەو قسنە و ئەم بارەشی بە دیاری بۆ ئەبەم، بەڵکوو دوعام بۆ بکا لەلای خوا کە بمکا بە پیاو. من ئەم عەزیەتەی بەسەر شانمەوەیە بۆم هەڵناگیرێ. مام تەها تۆزێ ڕاما و وتی:

ئافرەت واز بێنە لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە. ژن بی و پیاو بی من تازە پێت فێر بووم هەر ئەتگێم.

١٧٦. فەقێ محەمەدی هەمەوەند لە سەردەمی ئینگلیزەکانا بووبوو بە مودیری ناحیەی بازیان. ڕۆژێک عەولای سێتەبەسەر هەبوو، لەسەر ئیشێک هێنابوویان بۆ لای فەقێ محەمەد. ئەویش حوکمی ئەدا بە حەو ڕۆژ حەپس. عەولا ئەڵێ: وەڵڵا فەقێ محەمەد حەپس نابم. ئەڵێ: چۆن حەپس نابی؟ مەحکەمە حوکمی کردووە بە سەرتا. ئەڵێ: هەزار مەحکەمە حوکمی کردبێ بە سەرما حەپس نابم. فەقێ محەمەدیش ئەڵێ:

بچۆ دەرەوە سەگباب! حەپس ئەبی، حەپس نابی چاوت دەرئەهات خۆ بۆ من حەپس نابی.

عەولا دێتە دەرەوە لووس و باریک ئەڕوا بەڕێی خۆیەوە.

١٧٧. شێخ عومەر گێڕایەوە وتی: برایمبەگی سەروقامیش هەبوو ڕۆژێک بە ژنێک ئەڵێ: گانێکم بەرێ بۆ هەردووکمان باشە.

ژنە ئەڵێ: بۆ تۆ باشە، چونکە خۆت ڕەحەت ئەکەی. بەڵام بۆ من هیچ باش نییە، چونکە عەیبە و حەیای هەردووکمان ئەچێ.

برایمبەگ ئەڵێ: بۆچی عەیبە؟ ژنە ئەڵێ: ئەی چۆن، حەیامان ئەچێ!. ئەڵێ: کەواتە هیچ، من نەمزانی عەیبە چۆن گووی وا ئەخۆم کە حەیای خۆم و خۆت بەرم.

١٧٨. محەمەدئەمین عوسمان گێڕایەوە وتی: لەو سەرە ژنێك هەبوو بە هەرجۆر بوو مێردە پیرەکەی خۆی هێنایە سەر ئەوەکە گەمەوگاڵتەیەك بکەن. کردیان؛ پاشان ژنەکە ئاوی بۆ گەرم کرد، ئەمجا ئاوێکی زۆر گەرمی کرد بە سەرا و کابرا خۆی ڕانەگرت تڕێکی کەند. ئەمجا جامێ ئاوی ساردی کرد بە سەرا ئەویش زۆر سارد بوو بەویش تڕێکی کەند. ئەمجا ژنە بۆ ئەوە خۆی بشواتەوە وتی:

بێ‌قەزابی سەگباب چیت لێ بکەم؟ نە بەرگەی سەرما ئەگری و نە بەرگەی گەرما.

١٧٩. «تازەخورماتوو» دێیەکە لە تەنیشت کەرکووکەوە. لە زەمانی عوسمانییەکانا لە سەردەمی غەزا غەزاکەدا «یوزباشی»ـیەك ئەچێتە ئەوێ بەچەند زەفتیەیەکەوە، خەڵکەکە کۆ ئەکاتەوە و پێیان ئەڵێ:

ئەوا غەزایە و بۆ ئیسلامە؛ سوڵتان ئەمری فەرمووە هەموو موسڵمانێك بچێت بۆ غەزا پێشی کافرەکان بگرێت و هەموویان سەر ببڕن. ئەمە بۆ بەرزبوونەوەی ئیسلام گەورەترین شتە و هەرکەسەش لە ڕۆژی قیامەتا تۆڵەی چاکەی خۆی وەرئەگرێتەوە.

خەڵکەکە هەموویان گوێیان لەم قسەیە بوو، سێ چوارێ لە ڕیش‌سپییەکانیان وتیان: جەنابی یوزباشی دەرفەتمان بدەرێ، سبەینێ وەڵامت ئەدەینەوە. یوزباشی وتی: باشە. لە سبەینێدا ڕیش‌سپی و دەمڕاستەکان هەموو تەگبیریان کردە یەك و چوونەوە بۆلای یوزباشی و وتیان:

جەنابی یوزباشی، خۆت ئەزانی ئێستە وەختی حاسڵات و کاسبی و

دەغڵودان هەڵگرتنە، ئێمە بۆمان ڕێ ناکەوێ بین و بچین بۆ ئەو وڵاتی کافرانە. بەشی خۆمانمان بۆ بنێرن، ئێمە خۆمان لێرە بە ئامن و زامن سەریان ئەبڕین و بۆ متمانەش چەند کەسمان بەر ئەکەوێ بۆ سەر بڕین، ئەوەندە کەللە سەر ئەنێرینەوە بۆ جەنابی سوڵتان!.

.١٨٠ ئێمە لەگەڵ ئەو سەردەمە کوڕوکاڵ بووین، عومەر یاسین هەبوو، سەرتاش بوو لە بەغدا. دووکانەکەی لە جادەی ڕەشید بوو، لە نزیکی مزگەوتی حەیدەرخانەوە. «سیمۆن»ـی ڕەحمەتیش لەوبەر بوو.

ئەو سەردەمە «پاس»ـەتەختەکان لەسەر جادەی ڕەشید ئیشی دەکرد. لە «باب الشرجی»وە ئەهات بۆ «کاظمَین» ئەچوو. یەکێ لە جێگاکان کە تیایا ئەوەستا زیاتر بەر دووکانەکەی عومەر بوو. لەوێ ئەوەستا و بانگی ئەکرد «کازم کازم» کرێش بە چوار پوول بوو؛ وەیا بڵێین: بە عانەیەك بوو.

ئێمەی کوڕوکاڵ دانیشتبووین لە دووکانەکەی وەستا عومەر، پیاوێکی خەڵکی ئەو شارەزوورە «مارف»ـی ناو بوو بەهۆی بورهانی حامدبەگەوە ئەویش لەوێ بوو. لەولاوە پاس، یەك بەشوێن یەکا دێت و هەریەکە بۆ خۆی بانگ ئەکا «کازم کازم».

ئەوەندەمان زانی مارف ڕاپەڕی و چوو یەقەی یەکێ لە شاگردی ئۆتۆمۆبێلچییەکانی گرت و بە کوردی دەستی کرد بە جنێودان پێی و وتی:

ئاخر ئەوە شێخەولقادر- ڕۆحم وە قوروانی وێ!- بۆچ گووی کردگە وە خۆیا؟ ئاخر ئەم کازم کازمە بوو وەچی وا تۆ هەروەکوو زیقاوڵە داگتە وە یەکا و وە کازم کازم ئەو ناوەت هەراس کردگە؟

کابرای شاگردیش واقی و ڕما، نازانێ ئەم چی ئەڵێ. پاشان ئێمە چووین کابرامان هێنایەوە و پێمان وت: باوکم ئەوان ڕێگاکەیان وایە بۆ کازمەین

ئەچن. ئەبێ هەر بانگی ئەوێ بکەن. لەولاوە کە گەڕانەوە ئیتر هەر بانگی شێخ عەبدولقادر ئەکەن. وتی:

سا چووزانم خۆ شێخەولقادر- ڕۆحم وە قوروانی وێ!-له باوەژن نەوگە!.

**١٨١.** لەو سەرە «کانی ژنان» هەبوو. ژنان مەلەیان لێی ئەکرد. کابرایەکی «حەمەبۆر» ناو، چوو بۆ سەر کانییەکە. ژنەکان ڕووت بوون، ئەویش لە ناکاو چوو بە سەریانا. ژنەکان شڵەژان و کەوتنە پەلە. حەمەبۆر هەر بە نیازی بینینی ئەوان چووبوو، خۆی کردبوو بە کوێر. بە تەقەتەقی گۆچان چووە پێشیان. ژنەکان وتیان: خۆ ئەوە کوێرە.

یەکێکیان بە ڕووتی هاتە بەردەمی حەمەبۆر و ویستی تاقی بکاتەوە: دەستی خستە سەر سەری خۆی و وتی: ئەوە ئەبینی؟ حەمەبۆر وتی: نەء. دەستی خستە سەر چاوی وتی: ئەمە ئەبینی؟ وتی: نەء. دەستی خستە سەر مەمکی وتی: ئەوە ئەبینی؟ وتی: نەء. دەستی خستە سەر ناوکی وتی: ئەوە ئەبینی؟ وتی: نەء. ئەمجا دەستی خستە سەر دوابڕاوەکە وتی: ئەوە ئەبینی؟ وتی: «جا ئەگەر ئەوە نەبینم کەواتە کوێری دنیا و قیامەتم!».



# ڕووداوەکانی ڕابردوو

١٨٢. ساڵی (١٩٥٦) ڕۆژی ٨/١٠ ی ئەو ساڵە بوو من لە مزگەوتە شەڕەکەم بووم لە بەغدا. دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو. دەورەی مزگەوتەکە پڕ بوو لە خەڵك. ئەوەندەم زانی «شێخ مەحموودی حەفید» بە پێپلینکەکانا سەرکەوت و سەری کرد بە ژوورەکەی منا. ئەو شێخ مەحموودە کە وەختی خۆی ئەتوت شێرە، لاواز و باریك بووبوو. هەر ئەو نەخۆشییەی بوو کە لەو ساڵەدا بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد.

هەر من و ئەو بووین لە ژوورەکەدا. حەوشە و دەوری مزگەوت پڕ بووبوو لە خەڵك؛ چونکە شێخ مەحموود هاتۆتە ئەوێ و ئەیانەوێ چاویان پێبکەوێ.

وردە وردە دەستی کرد بە قسە کردن و بە دەردەدڵ کردن. فرمێسك بەسەر گۆناکانیا هاتە خوارەوە وتی: زابتەکان و زۆرتر لەوانەی کە لەگەڵما بوون، هەموو خیانەتیان لەگەڵ کردم. فرمێسکیش بەسەر گۆنایا هەر دێتە خوارەوە. لە گەرمەی ئەو قسەکردنەیا ئەوەندەم زانی لەگەڵ ئەو بێهێزییەشیا هەستا و ناچەوانی ماچ کردم و وتی: ڕۆڵە هومێدم بە کەس نەماوە بە تۆ نەبێ. وتم: یا شێخ! ئەوە چی ئەفەرمووی؟ من چیم؟ چ کەسم؟ چ پشت و عەشرەتێکم هەیە؟ وتی: ڕۆڵە تۆ قەڵەمت بە دەستەوەیە، قەڵەم لە شیر بە بڕشتترە. ئەمەی وت و هەستا. وتم: یا شێخ! وەختی نوێژ هاتووە، نوێژ ناکەی لێرە؟ وتی: بەڕێوەڵڵا. ئیتر چووینە

خوارەوە نوێژمان کرد و ئەو ڕۆیشت؛ بەڵام لەبەر زۆری خەڵك کە بۆ چاوپێکەوتنی شێخ مەحموود هاتبوون، زۆر بە زەحمەت دەرباز بوو.

**١٨٣.** ساڵی (١٩٣٤) بوو لەو بناری «چەقژ» و «قایکەند»ە خێڵێکی سمایل عوزەیری خستبوویان. دنیا ڕەمەزان و زستان بوو. من ئەو ڕەمەزانە لە ماڵی دەروێش سمایل بووم. لە خێڵەکە جووتە گەماڵێکی ناقۆڵایان هەبوو نەمئەوێرا دەرچم، ئەگەر یەکێکم لەگەڵ نەبوایە. تا لەگەڵ سەگەکانا بووین بە دەستەبرا و ئەوان منیان ناسی، ئیتر من لەوێ نەمام. بە شەو لە دیواخانەکەی دەروێش سمایلا دائەنیشتین. کوڕوکاڵ کۆ ئەبوونەوە لە هەموو ئاشێك لێمان ئەکرد.

کوڕێکی خزمیان هەبوو ناوی عەلە بوو. تەمەنی لە بەینی بیستوپێنج تا بیستوهەشت ساڵ ئەبوو. باڵا بەرزی باریکەلەی موو زەرد. کەوا و سەڵتەی لەبەرا بوو، جامەدانەیەکی لوول دابوو بە دەور سەریەوە، پشتێنێکی باریکی بەستبوو. کیسە تووتنێکی چیتی درێژی کردبوو، بەلای پشتێنەکەیا. قسەی شەوانی کۆڕ بەشی زۆری هەر هی ئەو بوو. باسی دزی خۆی ئەکرد. ژنانیش لەودیوی دیواخانەکەوە دانیشتبوون. وتی:

شەوێك ئەوا بارانە و ڕەشە شەوە. چووم بۆ دزی بۆ دەوری بازیان. چوومە ئاوایی دەرگەزێنە و سەگەل لێم کۆ بوونەوە و کردیان بە حەپ و لوور. هەندێ نانم لەگەڵ خۆم بردبوو بۆیان، جارجار کەرتەنانێکم بۆ فڕێ ئەدان. ئەپلکان بە نانەکەوە من هەندێك پێش ئەکەوتم، هەتا خۆمم کوتایە پاڵ دیوارێك. سەگەل دیسان لێم کۆ بوونەوە. دنیا پاش نیوەشەوە، هێنام بە چوار چەنگۆڵە دەستم کرد بە ڕۆیشتن بۆ دیواری ئەو دیوی خانووەکە. قاچێکم کرد بە کلك بۆ خۆم.

کە گەیشتە ئێرە دەستی برد کیسە توووتنەکەی لە لاقەدی کردەوە؛ پەڕەیەکی «بەرماخ»ـی [دەرهێنا] و توووتنی کرد بە سەرا و ئەیماڵی بەسەر پەنجە گەورەیا بۆ ئەوە توند ببێ. جگەرەی پڕ کرد. کوانووەکە ئاگری تێدا بوو، نای بە ئاگرەکەوە. جگەرە داگیرسا و نای بە لێویەوە، دەستێکی برد تۆزێ کڵاو و جامەدانەکەی لار کردەوە، بزەیەکی کرد و تێ هەڵچووەوە.

کە چوومە پاڵ دیوارەکە بلۆسکم لەگەڵ خۆم بردبوو، دەستم کرد بە کەندنەوەی دیوارەکە لەسەر خۆم. (ژنان لەو دیوە و پیاوان لەم دیوە کش و مات هەموو لەشیان بوو بە گوێ بۆ قسەکانی عەلە) وردە وردە کونم کردە دیوارەکە، چوومە ژوورەوە. دوو بەرانی دابەستەی لێ بوو، دامنە پێش خۆم و هاتمە دەرەوە. (بزەیەکی تری بۆ کرد) سەگەل شوێنم کەوتنەوە، نانم بۆ هەڵگرتبوون، جار نا جار کەرتەنانێکم بۆ فڕێ ئەدان تا لە ئاوایی دەرچووم. پیرەبەرانگەلم هێنایەوە بۆ ماڵەوە. نەختێ لە خوریەکەیانم هەڵپاچی، شاخەکانیانم بە مۆرەسان تۆزێ تەنك کردەوە، لە پاش چەند ڕۆژێ کاورایەك هەبوو لە سولەیمانی عەلی برزوویان پێ ئەوت، بیستبووی من دابەستەم لایە، ناردی؛ پێم فرۆشتن وە پەنجا ڕووپیە. حساوی ڕووپیە هەر ماوو.

ئەمە، دزی لەو سەردەمەدا بە ئازایەتی و پیاوەتی ئەزانرا؛ ئێستە دزی بووە بە عەیبە. دیارە هەر ڕۆژێ شتێك لە باو دایە!.

.١٨٤ گەلێ ناوداران و شاسواران و خاوەن دیواخان لەو وڵاتی کوردەوارییە هەڵکەوتووون، بەڵام ناویان لەگەڵ لەشیانا چووەتە گۆڕەوە! «مَعْن ابن زائِدَة» لە نەتەوەیەکی ترە؛ گەلێ قەڵەمی بۆ نان بدەیی کەوتۆتە کار، بەڵام لە کورددا کەسێك نەبووە کە کەسێك زیندوو بکاتەوە!.

حەمەی باجی هامینە هەبوو، ئەم حەمەیە لە سەردەمی تورکەکانا زەفتیە، پاشان دەرچووبوو پیاوی ماڵی خۆی بوو، تەمەنێکی باشی ڕابواردبوو، تا ئەم دەورەی دواییەش هەر مابوو، وتی:

بە گەلێ پێش گرانی گەورە، ڕێمکەوتە «کۆیە» حەمەغای کۆیە بووبوو بە پیاو، وردەوردە ناوی دەرئەکرد، دیواخانی ڕاکێشابوو هەموو ڕۆژێ نیوەڕۆ و ئێوارە چەند سینی ئەهاتە دیواخان، هەر بە دوو زەلام لەسەر سینییەك دائەنیشتن، پڵاو و چێشتی شلە لەسەر سینییەکان بوو، ئەم جۆرە شتانە لە هەموو دیوەخانێك هەبوو، بەڵام لە دیواخانی حەمەغادا ناسراو و نەناسراو جیا نەئەکرایەوە، ئەو میوانە ناسراو بوایە یا نەناسراو، خزم بوایە یا بێگانە، ئاغا بوایە یا سەپان، سوار بوایە یا پیادە، لە دیواخانا بە یەك چاو سەیر ئەکرا، ئالێکیش بۆ وڵاخ یەك ئالێك بوو، لێپرسینەوە بۆ هیچ شتێك نەبوو. وتی:

لە ڕێگایەکی دوورەوە چووم بۆ کۆیە، بووم بە میوانی دیواخانی حەمەغا بەبێ ئەوە بمناسن، ماینێکم لە ژێرا بوو، لە پاش چەند ڕۆژێك ماینەکەم تۆپی، لە دەوڵەتی دنیاش لەو ماینە بەولاوە هیچیتر شك نابەم، زۆر بۆی کەوتمە پەرۆشەوە، تا ماینەکەم مابوو هەموو ڕۆژێ ئەچووم توورەکەم ئەبرد کا و جۆم بۆ وەئەگرت، بۆم ئەهێنا. فیکرم هاتە سەر ئەوە کە هەر بچم کا و جۆکە وەربگرم. هەموو ڕۆژێ بەیانی و ئێوارە ئەچووم ئالێکم ئەهێنا و ئەهاتمەوە؛ لە ژوورێکا کۆم کردەوە تا زۆر بوو، ئەمجا هێنام فرۆشتم، بەو پارەیە ماینێکیترم کڕی. لەم ماوە دوور و درێژەدا یەکێ نەبوو لێم بپرسێ بڵێ: ئەرێ برا تۆ چیت؟ چ کەسی؟ لە کوێوە هاتووی؟!

کە بوومەوە بە سوار ئیتر هاتمە سەر ئەوە بڕۆم، چووم بۆلای حەمەغا دەستم ماچ کرد، وتی: هەرامە تۆ کێیت؟ حاڵەکەی خۆمم بە تەواوی بۆ گێڕایەوە وتم: خوا ئەم دیواخان و وەجاخە تێك نەدا، وتی: هەرامە بۆ

ئەڕۆی؟ دانیشە لای من، وتم: قوربان ئەبێ بچمەوە بۆ وڵاتی خۆم و بۆ ناو ماڵ و منالّم، وتی: هەرامە ناوت چییە؟ وتم: قوربان حەمەی باجی هامینەم پێ‌ئەڵێن. وتی: ڕۆڵە ئەم بەینە بە نەناسراوی دانیشتووی، ئیمشەویش بە ناسراوی دانیشە، وتم: بەڵێ.

بەیانی دەمەو چێشتەنگاو بوو بانگی کردم: هەرامەکەی سولەیمانی، هەستام چوومە بەردەمی و وتم: بەڵێ قوربان. وتی: ڕۆڵە تۆ ئەو ماینەت وای لێ هات بۆ لە هەوەڵجارەوە دەنگت نەکرد، وا ئەم بەینە خۆتت لە ماڵ و منال دوور خستەوە؟!

وتی: دەستت بێنە، مستی هێنا شتێکی کردە دەستم و وتی: ئەوەش بەرە بۆ ماڵ و منالەکەت، هەر جارەش هامشۆمان بکە. دەستم ماچ کرد و هاتمە دەرەوە، کە شتەکەی مستیم بژارد، سەیرم کرد پەنجا لیرەیە. وتی: هەر جارەش هاتوچۆم ئەکرد.

لە ساڵی گرانییە گەورەکەدا ئەو قاتوقڕە بوو کە هەبوو، حەمەغا چەند مەنجەڵی زنجیر لە ملی ڕیز ئەکرد، هەموو ئێوارەیەك هەرچی هەژار و بێ‌دەسەلاتی کۆیە هەبوو ـ تەنانەت هی لادێ نزیکەکانیش ـ ئەهاتن بە قەرەوان شۆربایان ئەبرد و هەریەکە نوێردە نانێکیشیان ئەدانێ، ئەمە حالّی حەمەغای کۆیە بوو تا گرانییەکە بەسەر چووا!

**١٨٥.** غەفووری حاجی سەعی نانەوا، لە سولەیمانی ناردی بۆ ڕشتە: کە لەم وڵاتی کوردەوارییە گەلێ پیاوی بەنان و خوان و بەخشندە هەبووە وتی:

باوکم بۆی گێڕامەوە ئەویش لە دەم باوکی خۆیەوە گێڕاویەتەوە وتی: بەو بەری ماڵەکەی خۆمانەوە ئەو دالانە ئەبینی؟ ئەوە ماڵی «برایم‌پاشا»یە کە بە «برایمی خویلە» بەناوبانگە. ئەم برایم پاشایە ناوی بە دڵنەرمی

دەرکردبوو. زۆر ئاقڵ و لەسەرخۆ بوو. ئازاری بە کەس نەئەگەیاند، هەر هەژارە لێقەوماوێك بچوایەتە ماڵەکەی، دڵی نەئەشکاند و بە دڵی خۆی ڕازی ئەکرد.

ڕۆژێ برایمپاشا لە ماڵ هاتە دەرەوە بەرەوژوور بووەوە. چەند خزمەتکار و دەست و پێوەندێکی لەگەڵا بوو. تووشی دوو کوێر بوو، ئەوان چاویان نەبوو؛ لەبەر خۆیانەوە قسەیان ئەکرد. یەکێکیان وتی: ئەم کافرەی کاکەییە تۆ بڵێی شتێکمان بداتێ؟ ئەوی‌تریشیان وتی: مەلعوونەی کافرە! ئەڵێن: دڵی باشە؛ باوەڕ ناکەم بە دەستی خاڵی بگەڕێینەوە.

برایمپاشا گوێی لەم قسانە بوو، تێگەیشت کە بەو ئەڵێن. بێ‌دەنگ بە دەست و پێوەندەکانی وت: بگەڕێنەوە. لە پێش کوێرەکانا گەیشتنەوە ماڵەوە. بە خزمەتچییەکەی وت: لە بەردەرگاکە ڕاوەستە کە کوێرەکان هاتن بیانهێنە ژوورەوە. کە کوێرەکان هاتن دەستی گرتن و بردنیە دیواخان بۆ لای برایمپاشا. برایمپاشا بەخێراتنێکی گەرموگوڕی کردن و وتی: ئەمرێکتان هەیە؟

وتیان: پاشام! خوا ڕاوەستاوت کات! کوێرین هاتووین خەرجییەکمان بدەیتێ، دوعای خێرت بۆ ئەکەین، خوا موەفەقت بکات. پاشا وتی: ئەوە لە ڕێگادا چیتان ئەوت؟ بۆم بگێڕنەوە بێ‌بەشتان ناکەم. وتیان: پاشا چیمان ئەوت. هەر دوعای خێرمان بۆ ئەکردی. پاشا وتی: من ئەمانە نازانم! قسەیەکتان کردووە ئەبێ بۆم بگێڕنەوە؛ بەڕاستی بۆم بگێڕنەوە. هیچ درۆ و دەلەسەی تێدا مەکەن. ئەوانیش ناچار بوون وتیان: پاشا بۆت ئەگێڕینەوە، بەڵام با دیواخانەکەت چۆڵ بێ. وتی: من ئەمەوێ تا دیواخان چۆڵ نەبووە بۆم بگێڕنەوە. با ئەم مەجلسەش گوێیان لێ بێ. حافزەکان سەیریان کرد عیلاج نییە وتیان: یەکێکمان وتمان: ئەم

کافرەی کاکەییە تۆ بڵێی شتێکمان بداتێ؟ ئەوی‌کەشمان وتی: مەلعوونە کافرە ئەڵێن: دڵی باشە، باوەڕ ناکەم بە دەستی خاڵی بگەڕێینەوە.

پاشا وتی: من هەر ئەمەم ئەوێ. ئێستە ئێوە چیتان ئەوێ؟ وتیان: پاشا، کە ئیش وای لێ‌هات یەکێ بارێ چەڵتووکمان بدەرێ. پاشا بانگی کرد یەکێ سێ بار چەڵتووك و سێ هۆقە ڕۆنیان دانێ و وتی: بۆشیان بەرنە ماڵەوە. هەریەکە دە مەجیدیشی دانێ.

**١٨٦.** «سلێمان»ی حەمەجانی ڕوغزایی لە بنەماڵەی بەگزادەی جاف نەبوو، بەڵکوو لە کوێخاکانی جاف بوو. بەڵام دەمار و پیاوەتییەکەی شانی دابوو لە شانی هەموو بەگزادەیەکی ئەو سەردەمە.

ئەوەی من بینیم لە (١٩٢٨)دا لە کوێستانی بناری بانە، دەوارێکی دوانزە هەستوونی هەڵ دابوو. ڕەوەماین و ماڵاتی بە دەورەوە بوو. دوو کوڕی جوانکەلەی هەبوو تازە پێ‌ئەگەیشتن، هێشتا خەتیان نەدابوو. یەکێکیان حەمەسدیقی ناو بوو. هەریەکە «سێ‌تیر»ێکی ئێرانییان بە دەستەوە بوو؛ هەریەکە ماینێکی بەڕەختیان هەبوو سواری ئەبوون.

ئەو ڕۆژە خەبەریان هێنا کە «مەتحەت»ی برای خێزانەکەی لە گەرمیان کوژراوە. بوو بە قیامەت و شین و شەپۆڕ؛ هەرچی هۆبەی جاف هەبوو لەو وڵاتە کۆ بوونەوە.

سلێمان‌خان چەند گوندێکی وەکوو «قارەوا، دەرەشێخان» و «ماسێر»ی لەو وڵاتە کڕیبوو؛ هاتوچۆی گەرمیانی کەمتر ئەکردەوە. بە زستانان ئەچووە خانووی گوند و بە هاوینان ئەچووە دەوارەوە. پیاوێکی هەتا بڵێیت تەڕپۆش و قسەی دانەدانەی ئەکرد. هیچ خوێندەواری نەبوو، قسەڕەوا بوو لەو وڵاتەدا.

ئەم کارەساتەی دواوە خۆم بیستبووم، وە حەسەن بەگی جافیش بۆی گێڕامەوە وتی:

«ڕەزاشا» تازە بووبوو بە شای ئێران. هەچ بەگزادە و ئاغەواتی ئەو وڵاتی کوردەوارییە هەبوو، کۆی کردبوونەوە بۆ ئەوە قسەیان لەگەڵ بکا و ڕووی دڵیان لە پاش «ئەحمەدشا» بکاتە خۆی. هەموو بەگزادە و ئاغەوات بە ئەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە خۆیان ڕێك خستووە و ئەو تەدارەك و جلوبەرگەی کە شایانی دیدەنی ڕەزاشا بێ، لەبەریان کردووە. سلێمان خانیش یەکێکە لەوانە. بەگزادە و پیاوی گەورەی ئەو وڵاتە لە دەشتێکی پاندا ڕیزیان بەستووە. ڕەزاشا بە بەردەمیانا ئەڕوا و چاکوچۆنیان لەگەڵا ئەکا.

ڕەزاشا هەندێ ئەشرەفی زێڕینی بەناوی خۆیەوە داڕشتووە. ئەشرەفییەکان وان لەناو سینییەکی زیودا. یاوەرەکەی بەسەر دەستیەوەیە و بە شوێنیەوە. ڕەزاشا ئەگاتە بەردەمی هەر ئاغەیەك، دەست ئەبا یەکێ لەو ئەشرەفییانە هەڵئەگرێ و ئەیدا بە ئاغەکە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لوتفی شاهانەیە بەرانبەر بەو سەرۆکانە؛ نەوەك ئەشرەفییەکە.

ئەگاتە بەردەمی سلێمان خان ـ کە ئەویش لە سەرەکەدا ڕاوەستاوە ـ ڕەزاشا دەست ئەبا ئەشرەفییەك هەڵئەگرێ، سلێمان خانیش دەستی ڕاگرتووە، ئەیەوێ بیخاتە ناو دەستیەوە، ئەشرەفی دائەکەوێتە سەر ئەرز و ناکەوێتە ناو دەستی سلێمان خانەوە. ڕەزا شا چاوەڕێی ئەوە ئەکا کە سلێمان خان دانەوێتەوە ئەشرەفییەکە هەڵگرێتەوە. سلێمان خان بێزی نایەنێ دانەوێتەوە. ئەوا نزیکەی دووسەد بەگزادەش لەو ناوەدا ڕیزیان بەستووە. ڕەزاشا تۆزێ ڕائەوەستێ، سەیر ئەکا سلێمان خان ئەشرەفییەکە هەڵناگرێتەوە. ئەویش ئەکەوێتە تەقەوە دەست ئەبا

ئەشرەفییەکی‌تر هەڵئەگرێ و ئەیخاتە دەستی سلێمان‌خانەوە و لەسەر ئیشی خۆی ئەڕوا و دەست ئەکاتەوە بە گەڕان بە بەردەمی ڕیزەکەدا. عالەمەکەش هەموو چاویان لەمەیە.

لەپاشا لە سلێمان‌خانیان پرسی: بۆچ دانەنەویتەوە، مەرحەمەتی شاهانە هەڵگریتەوە کە ڕەزاشایش لەبەر دەمتا وەستا بوو؟ وتی: نەفسی خۆم فرە وە بەرزتر ئەزانم لەوە کە دانەومەوە بۆ مەرحەمەتی شاهانە!.

سلێمان‌خان پیاوێکی نەخوێندەوار بوو. بەڵام لە قسەکردنا جۆرە گوزارشتێکی سەیرسەیری هەبوو. حەسەن‌بەگ وتی: سەعی‌بەگی قادربەگی بادەڵان گێڕایەوە کە ئەمە چەند دانەیەکە لە قسەکانی سلێمان‌خان:

**لە بۆتەی «اِجمال»دا «سَدُّالباب» کریاگە.**

**ئا کورەکاورا وەعەزەمەوە.**

**قول ڕووت لە سەردا، زڕە لە ژێردا.**

**دەك خوا بوێ وە خوای ئەمانە.**

**ڕشتەی ئیختیار مەدە وە دەس کەسەوە.**

**هێمە فەریکەقوێخای شلێر نین.**

**یا مەرقەدەکەی کاك ئەحمەد.**

**ئاها برا، کەس لە فەرەزێکدا سدق و سیاقەتی بوێ.**

**لالە بڕۆ، غاردە، دەرقەیدی ماڵ مەوە، کاورا بیدە و هەرخەلاس وی.**

**چەرخی فەڵەك بناڵێنێ، گەرەك سەوز و سوور لە سەری دەربچێت مانگت ئەکەم.**

**١٨٧.** ئەوڕەحماناغای ئەحمەدئاغا لە سولەیمانی پیاوێکی خاوەن مڵك و دێهات بوو، لە زۆرتر گوندەکانیا لەبەر ئەوە ئاو و بەراویان

زۆر بوو، مەرزە ئەکرا. ساڵێك برنجێکی زۆر زۆری بۆ هات. پێش ئەوە برنج بێتە بەرهەم هەمووی فرۆشت. فرۆشتنەکەش هەر ئەوەندە بوو بە قسە؛ قسەی دا کە فرۆشتنی، ئەگینا پارەی وەرنەگرتبوو.

برنج لووتی بەرز کردەوە و سەر کەوت. ڕۆژبەڕۆژ هەر گرانتر ئەبوو. ئەو ساڵە جگە لە برنجەکەی ئەو هەچ مەرزە و برنجێك لە وڵاتی سولەیمانی هەبوو، هەمووی نەهاتی ڕووی تێ کرد. عەلاف و برنجکڕ هەموو ڕوویان کردە ئەوڕەحماناغا بۆ کڕین. ئەویش هەر ئەیوت: برنجم فرۆشتووە؛ برنج سێ قات و چوار قات سەرکەوت.

ئەمجا لە وڵاتی کەرکووك و مووسڵەوە ئەهاتن بۆ لای. ئەویش هەر ئەیوت: برنجم فرۆشتووە. تجارەکان لایان وا بوو کە ئەوڕەحماناغا بۆیە برنجەکەیان ناداتێ بەتەمای زیاترە. ئەچوون تکاکاریان ئەهێنا کە برنجەکەیان پێ بفرۆشێ. ئەوانیش ئەیانوت: بە کێت فرۆشتووە تا بچین لەوی بکڕین. ئەویش نەیئەوت. برنجیش ڕۆژبەڕۆژ لە سەرکەوتنە، ئەیانوت: ئاغا فرۆشتووتە فرۆشتووتە، ئێستە برنج تا شەش قات سەرکەوتوە، وە هێشتا نەشتداوە بە کڕیارەکە، پارەشەت هەر وەرنەگرتووە، ئەمە شەش قات پارەی برنج، شتێك بدە بە کابرای کڕیار زۆر مەمنوونیشت ئەبێ. خۆ ئەو هێشتا پوولێکی نەداوە بە تۆ. وە برنجیش هێشتا نەهاتۆتە بەرهەم، تا تۆ بڵێیت شتێکی تێدایە.

برنجکڕی هەموو لایەك بە تەواوی ئەوڕەحماناغایان وەڕەز کرد و حەیشیان پێ تاڵ کرد. لە ئاخرا وتی: ئەوە ئێوە ئەڵێن چی؟ من برنجم فرۆشتووە، خۆ شەرەفم نەفرۆشتووە. هەمووم داوە بە مەلا حەسەنی عەلاف بچن لەوی بکڕن.

١٨٨. حاجی مەلا ساڵحێکی هەولێری هەبوو، پیاوێکی دەوڵەمەند و بەدەسەڵات بوو. ڕۆژێك لە کۆڵانێکا ڕووپیەیەکی لێ ون ئەبێ، زۆر بۆی ئەگەڕێ نایدۆزێتەوە. حەوت هەشت مناڵ کۆ ئەکاتەوە پێیان ئەڵێ: بگەڕێن بۆ ئەو ڕووپیەیە، هەرکەس دیەوە دوو ڕووپیەی ئەدەمێ. مناڵان ئەگەڕێن، یەکێکیان ئەیبینێتەوە، ئەیداتەوە بە حاجی مەلا ساڵح. ئەویش لێی وەرئەگرێ و ئەیخاتەوە باخەڵی، دەست ئەبا دوو ڕووپیە ئەدا بە مناڵەکە و لێك جیا ئەبنەوە. لێیان پرسی: حاجی مەلا، تۆ ئەمە چی بوو کردت؟ دوو ڕووپیەت دا بە ڕووپیەیەك؟ وتی:

من مەبەستم ڕووپیەکە نەبوو، بەڵام تا من ماوم هەر جار بگەیشتمایە ئەو شوێنە بە دڵما ئەهات کە من ڕووپیەیەکم لەو شوێنەدا ون کردووە؛ چاوێکم بۆ ئەگێڕا. ئێستە خۆمم لەوە ڕزگار کرد!.

١٨٩. لە سەردەمی خۆیا ڕابواردنی مانگی ڕەمەزان لە سولەیمانی جۆرە ڕابواردنێك بوو. ڕادیۆ و ئەملاوئەولا هیچ نەبوو. یەکێك لەو ڕابواردنانە ئەوەبوو: لە ساڵانی ١٩٣٠ بەدواوە تا ڕادیۆ داهات.

مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵ لە مزگەوتەکەی خۆیا (مزگەوتی باشچاوەش) لە پاش ئەوە کە هەرکەسە لە ماڵی خۆیا بەربانگی ئەکردەوە، ئەهات بۆ مزگەوت. نوێژی تەراویح بە جەماعەت ئەکرا، لەحوجرەکەدا سەماوەر تێ‌ئەخرا و خەڵك ئەچوونە ئەوێ دائەنیشتن. لە دەرەوەی گەڕەکیش هەر ئەهاتن. مەلا مستەفا دەستی ئەکرد بە خوێندنەوەی «فتووحاتی شام»ڕستەڕستە عەرەبییەکەی ئەخوێندەوە و هەر خێرا ئەیکرد بە کوردی؛ تام و لەزەتێکی‌تری ئەدایە.

هەرکەسێك شەوێك بهاتایە ئیتر دڵی نەئەهات بەجێی بێڵێ. کە

ئەگەیشتە شوێنی شەڕ و سەرکەوتنی ئەسحابەیەك دەنگی: «هەی باوکەکەم، هەیماڵم» لە خەڵکەوە بەرز ئەبووەوە. هەر لە بەینی ماوەیەکدا ئەوەستا، پشوویەکی ئەدا و ئەیوت: عەولخالق چا تێکە. شەکر و چاش خەڵکەکە ئەیانهێنا. ئەگەر هەر شەوێ نەبوایە مەلا مستەفا خۆی ئەینارد ئەیانهێنا. برایم‌خان ئەو سەردەمە هەڕەتی بوو، کە ئەهات دائەنیشت، ئەیوت: ئا بچن دە کەللە شەکر و هۆقەیێ چا بێنن. بەم جۆرە ڕایائەبوارد هەتا پارشێو. کە سەلای پارشێو ئەکرا هەرکەسە ئەچووەوە بۆ ماڵی خۆی.

مەلا تۆفیقی عەتار ماڵەکەیان لە تەنیشتی مزگەوتەکەوە بوو. ئەویش لە ماڵەکەی خۆیا ئەم کۆڕەی پێکەوە ئەنا. ژوورەکان هەموو پڕ ئەبوون، چایەکی بۆ دائەنا، بەین‌بەینیش چای ئەگێڕا بە عالەمەکەدا. مەسرەفی شەکر و چا و جگەرە هەمووی لەسەر خۆی بوو. ئەویش هەر فتووحاتی واقدی ئەخوێندەوە. جارجاریش غەزای بەدر و حونەینی ئەخوێندەوە. ئەو تا پارشێو دانەئەنشیت؛ بە حسابی ئیمڕۆ ئەبوو بە سەعات دە و یانزە دوایی پێ ئەهێنا و خەڵکەکە هەڵئەستان. ئەوی هەوەسی بوایە و خەوی نەهاتایە کە لەوێ هەڵئەستا ئەچووە کۆڕەکەی مەلا مستەفاوە؛ چونکە ئەو گەرم بوو تا پارشێو.

**١٩٠.** شێخ محەمەدئەمینی میرانی بۆی گێڕامەوە وتی: «ناوەکار[1]»ێك لە سنە بوو «حەمالی» ناو بوو. ئەو حەمالییە هەموو جار «گا»یەکی خستۆتە ناو ناوەکەی بە پەیژەی سی چل پلەکانەدا سەری

---

١. ناوە: دەفرێکی درێژکارە و قووڵ، لە تەختە دروستکراوە، بنەکەی تەخت و تەسکترە، هەتا دێت بە لای لێواری سەرەوە فراوانتر ئەبێتەوە، لباد و لۆکە کوتراوە و درواوە بە بنەکەیەوە، وێنەکەی وە نەبێ قووڵ بێ، وەکوو دۆلکە، بەڵکوو درێژ و پانە، واتە «مستطیل»ـە. ئەو کەسەش کە ئەم «ناوە»یە هەڵئەگرێ پێی ئەڵێن: ناوەکار.

خستووە بۆ نهۆمی دووهەم و سەربان. ئەم ئیشەی کە ئەکرد لە دوای تەواو بوون و لێبوونەوە بوو لە سواغی سەر بانەکە. ئەو جۆرە خانووانە هی ئەعیان و پیاوە گەورەکانی سنە بوو.

کە لێی ئەبوونەوە گای ئەبردە سەربان، ئەوانیش خەڵاتیان ئەکرد. ئەمجا هەر بە شوێنەکەی خۆیا گایەکەی ئەخستە ناو ناوەکەی و ئەیهێنایەوە خوارەوە. ئەو ئاخر ڕۆژە کە ئەم ئیشە ئەبوو هەموو عالەمی سنە ئەچوون بۆ سەیری ئەو دیمەنە.

جارێك یەکێ لە شازادەکانی ئێران ئەچێتە سنە؛ دوور نییە فەرامیرزا بووبێت. ئەم باسەی بۆ ئەگێڕنەوە کە پیاوێك لێرەدا هەیە گا ئەباتە سەربان. ئەنێرێ بەشوێنیا ئەیهێنن؛ پێی ئەڵێ: تۆ شتی وا ئەکەی؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: بیبینم. ئەویش ناوەکەی دێنێ لەگەڵ گاکەیا ئەیخاتە ناویەوە و سەری ئەخا بۆ سەربانی دەرماڵ. شازادە ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ، خەلاتێکی باشی ئەکا و پێی ئەڵێ: پێم بڵێ تۆ چۆن ئەمە ئەکەی؟

ئەڵێ: شاهم ئەم گایە کە تۆ بەم گەورەییە ئەیبینی، گوێرەکەیەکی بچووك بوو. ئەو ڕۆژە کە لە دایك بوو خستمە ناو ئەم ناوەیە بردمە سەربان و هێنامە خوارەوە. لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستە بووە بەم گایە هەموو ڕۆژێك ڕۆژبوارم نەکردووە؛ بردوومەتە سەربان و هێناومەتەوە خوارەوە. یەکەم ڕۆژ کە ئەمە گوێرەکە بوو چۆن بووە هەستم بە قورسایی نەکردووە، ئێستەش هەر وامە!.

شازادە ئافەرینێکی تەواوی ئەکا و ئەڵێ: چاك کردن لە زۆر کردنە.

١٩١. حسابی بکە لە (١٩٤٠)ەوە تا (١٩٥٠)، کە ساڵی کۆچی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد بوو، هەموو ساڵێ من لە ٢٢ی ئاغستۆسەوە

لە بەغدا دەرئەچووم ڕووەو کوردەواری بۆ ئاخری ئەیلوول ئەگەڕامەوە.

لەو گەشتەما شوێنی هەرە زۆرم سولەیمانی بوو. کە ئەچوومەوە سولەیمانیش ئەوە لەلای پیرەمێرد بووم. قسە لێرەدایە: کە ڕابواردنی ئەو وەختەی سولەیمانی چۆن بوو؟

پیرەمێرد ماڵەکەی لە تەنیشت مەکینەی کارەبا کۆنەکەوە بوو، بەلای مزگەوتی هەمزاغاوە. چاپخانەکەش هەر لەو ماڵەدا بوو. لای ژووررووی بەرهەیوان کەلەگی بوو، لای خوارووی مەوبەق و ژووری‌تر بوو. خەلیل قوبووڵی و بامیەکەی بۆ دروست ئەکردین. لای ڕاست ژووری چاپخانەکە بوو. عەلی و ئەحمەد خەریکی چاپخانەکە بوون. لای چەپ باغچە بوو. حەوزەکەش لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو.

بە شەوان ئەربابی زەوق و ئەدەب کۆ ئەبوونەوە، وا تێ‌ئەگەیشتم زیاتری لەبەر من بوو. پیرەمێرد شووتی ئەخستە ناو حەوزەکە و بە چواردەوری حەوزەکەدا میوەی ترێ و هەنجیر و هەڵووژەی دائەنا. گڵۆپی کارەباش بە سەریەوە دیمەنێکی‌تری هەبوو. دەنگی مەکینەی کارەباکەش لە دەنگی چەقەنەی ئاش ئەچوو.

ئەرباب کۆ ئەبوونەوە: جەمیل ئەفەندی، جەلال ئەفەندی، سەی فەتحوڵڵا، حاجی مستەفا، ڕەمزی ئەفەندی، مەلا مارف، ئەمانە بێجگە لە جەلال ئەفەندی خەریکی یاری ئەبوون. ئەوپەڕی یارییەکەش تا دینار و نیوێك بوو. ئەوانە کۆڕێك بوون.

لەملاوە لە بەر بەرهەیوانەکە کۆڕی ئەدەب و شیعر بوو. جەلال ئەفەندی، زۆرجار مەلا مەحموودی بێخۆد، مەلا مستەفای سەفوەت، نەجمەدین مەلا، هەندێ جار شێخ محەمەدی خاڵ بە خۆی و براکانی و دەستەی خۆیەوە ئەهاتن. فایق هۆشیار کە ئەو سەردەمە لە حقووق

بوو بە هاوینان ئەهاتەوە. منیش لەناو ئەم دەستەیەدا بووم. نووری عەلی ئەجزاچیش هەر ئەهات؛ ئەو زیاتر لە قسەکانی ڕەزابەگی بۆ ئەگێڕامەوە.

کوڕێکی‌تر لەولاوە لە مەلا ئەحمەد دیلان و حەمەی بەکر و هەندێ جاریش ڕەشۆل بە دەنگە مەلائیکەییەکەیان و بە نەوای «ئای ئای» نەوەك دانیشتووەکان، بەڵکوو دار و گوڵەکانیشیان ئەخستە جووڵە. پیرەمێردیش خۆی بەسەر ئەم کۆڕانەدا ئەسووڕایەوە؛ لەگەڵ هەموویانا هاوبەشی ئەکرد، تەنیا لەگەڵ گۆیندەکانا نەبێ، چونکە دەنگی خۆش نەبوو. ڕەمزی ئەفەندیش گەلێ جار یارییەکەی بەجێ ئەهێشت و لەگەڵ ئەربابەکانیا تێکەڵاوی کۆڕ ئەبوون و چەند بە دەمی خۆش بوو کە ئەیوت: خاڵە ناوی ناوم: «سلطان الشعرا». مەبەستی بە خاڵە پیرەمێرد بوو. خەلیلیش بەین‌بەین چای ئەهێنا و میوەی دائەنا.

وەختێ وا ئەبوو خاڵە ئەیدۆڕان؛ چونکە یاری نەئەزانی. دۆڕانەکەش وەکوو وتم: ئەوپەڕی دینار و نیوێك بوو. هەڵئەستا بە گۆچانەکەی دەری‌ئەکردن ئەیوت: تەماشا کە دێن شووتی و میوەکەشم ئەخۆن و پارەکەشم لێ ئەبەنەوە. بۆ سبەی شەوێ ئەو دەستەیە نەئەهاتنەوە، نەهاتنەوەیان لەبەر خۆ عەزیز کردنیان بوو؛ نەوەك لەبەر دەرکردنەکە. چونکە ئەیانزانی دەرکردنەکە هیچ قیمەتی نییە. ئەمجا بۆ ڕۆژی دوایی‌تر خاڵە بە تەلەفۆن و بە خۆی ئاشتی ئەکردنەوە و ئەیهێنانەوە. منیش ئەموت: خاڵە بۆچ بانگیان ئەکەیتەوە؟ ئەیوت: با جەمیل فێری ماڵان نەبێت.

بەم جۆرانە ئەم کۆڕانە ڕایائەبوارد. تا شەو درەنگ ئەبوو، ئەمجا بڵاوەیان لێ ئەکرد. ئەماینەوە من و ئەو. دائەنیشت داستانی کۆن و قسەی ڕابوردووی بۆ ئەگێڕامەوە تا من خەوم ئەهات. پاش ئەوە ئەچوو دەستنوێژێکی ئەشۆرد. هەندێ قورئانی ئەخوێند. دوو ڕکات نوێژی ئەکرد، دوای ئەوە

خەریکی نووسینی سەرمەقالە و نووسینی پەندی پێشینیان [بوو] بە شیعر، بۆ ڕۆژنامەکەی: «ژین».

ئەمە نموونەیەك بوو لە ڕابوردنی ئەوسای سولەیمانی.

**١٩٢.** ئەوا ئینگلیز ئیحتلالی عێراقی کردووە. مێجەرسۆن لە سولەیمانی تۆز ئەکا. زەبروزەنگێکی وا ئەنوێنێ هەر نەبێتەوە. فەرمانی دەرکردووە کە بە هەر شوێنێکا ئەو بڕوا ئەبێ خەڵکەکە هەموو ڕاوەستن و نەڕۆن تا ئەو ئەڕوا. ئەگەر بەناو بازاڕا تێپەڕی ئەبێ دووکاندارەکان بەرزەپێ هەموو ڕاوەستن.

مەلا عەلی مەڵکەندی هەموو ڕۆژێ لە ماڵەوە ئەهات. دووکانەکەی لە خوار مزگەوتەکەی ناو بازاڕەوە بوو، ئەچوو لەوێ دائەنیشت مۆری هەڵئەکەند.

ڕۆژێك مێجەرسۆن ئەیەوێ بچێ بۆ ناو بازاڕ، لە سەرا دەرئەچێت و ڕاست سەرەوخوار ئەبێتەوە بۆ ناوەڕاستی بازاڕەکە. بە بەر هەر دووکانێکا ئەڕوا خاوەن دووکان بەرزەپێ ڕاست ئەبێتەوە. بەو جۆرە ئەڕوا تا ئەگاتە بەر دووکانەکەی مەلا عەلی. سەیر ئەکا مەلا عەلی قورئانێك لەولایەوە و مۆریکیش بە دەستیەوەیە هەڵیئەکەنێ؛ نە هەستا و وە نە سەریشی لەسەر مۆرەکە بەرز ئەکاتەوە.

مێجەرسۆن لەمە زۆر تووڕە ئەبێ، گوێی ناداتێ، ئەڕوا سەرەوخوار. لەولاوە ئەگەڕێتەوە، تەماشا ئەکا مەلا عەلی هەر لە بەری هەڵناسێ. ئەچێ لە بەر دووکانەکەیا ڕائەوەستێ؛ ئەویش سەر بەرز ناکاتەوە. بە تووڕەییەکەوە ئەڵێ: مەلا عەلی ئەوە بۆچ هەڵناستی؟ مەلا عەلی سەر لەسەر مۆرەکە بەرز ئەکاتەوە، تەماشا ئەکا ئەمە مێجەرسۆنە. ئەڵێ:

بۆچ هەستم؟ ئەڵێ: نامناسی؟ ئەڵێ: بۆچ ناتناسم مێجەرسۆنیت. ئەڵێ: فەرمانەکەی منت نەبیستووە؟ ئەڵێ: بەڵێ بیستوومە. ئەڵێ: کەواتە بۆچ هەڵناستی؟ ئەڵێ: ئەم قورئانەی ئێمە ئەفەرموێ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾.

مێجەرسۆن زۆڵ و شەیتان ئەبێ ئەڵێ: مەلا عەلی تۆ ئەو ئایەتە بۆ من ئەخوێنیتەوە ئەی سەیری ئەو ئایەتە بۆ ناکەی کە ئەڵێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ﴾.

مەلا عەلی وا هەر دانیشتووە و هەڵناستێ ئەڵێ: بەڵێ، ئاگام لەوەش هەیە، بەڵام تۆ و غەیری تۆیش ئەبێ ئاگاتان لەو ئایەتەش هەبێ کە ئەفەرمووێ:

﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾.

مێجەرسۆن هەر چاوەڕێی ئەوەیە کە مەلاعەلی لە بەری هەستێ. حاجیاغا ئەو سەردەمە مودیری پۆلیس ئەبێ لە سولەیمانی، کە ئەچێتەوە ئەنێرێ بەشوێن حاجیاغادا ئەڵێ: بچۆ مەلا عەلیم بۆ بێنە. مودیری پۆلیس دێت و مەلا عەلی هەڵئەگرێ، لەڕێگادا پێی ئەڵێ: من کاربەدەستێکم لە بەردەست ئەم حاکمەدا، ئەبێ بێم و فەرمانەکەی جێبەجێ بکەم، تۆیش خەڵکی ولاتەکەمی و پیاوێکی پیر و موحتەرەمی، تکات لێ ئەکەم نەختێ بە نەرمونیانی لەگەڵیا بجووڵێوە و ڕەوشتی چاوپێکەوتنت لە بەرچاو بێ. مێجەرسۆن پیاوێکە کۆ لە هیچ ناکاتەوە و ئێستە حاکمی ئەم وڵاتەیە. بێئیحترامییەکت لەگەڵ بکا، ئێمە هەموو بەمە دڵبریندار

ئەبین و هیچیشمان لەدەست نایە.

مەلا عەلی ئەبا و لەلای مستەفا بەهجەت دایئەنێ ـ کە ئەو سەردەمە ئەو سکرتێری نووسینی مێجەرسۆن بوو ـ خۆی ئەچێتە ژوورەوە ئەڵێ: جەنابی مێجەرسۆن مەلا عەلی حازرە. ئەڵێ: با بێتە ژوورەوە. ئەو دەرئەچێ و مەلا عەلی ئەچێتە ژوورەوە. مودیری پۆلیس و سکرتێر و کاربەدەستانی تر لە پەنجەرەوە بێ، لە هەر کوێکەوە بێ سەیر ئەکەن بزانن چی ڕوو ئەدا.

کە مەلا عەلی ئەچێتە ژوورەوە مێجەرسۆن لە شوێنەکەی خۆی هەڵئەستێ و دێ بە پیریەوە دایئەنێ و خۆی لەلای خواروویەوە دائەنیشێ. ئەنێرێ چا و قاوە و شتە دێنن و ئەکەوێتە قسە کردن لەگەڵیا، وەکوو ئەو کارەساتەی بازاڕ هەر ڕووی نەدابێ. لە پاش قسە و ماریفەتێکی زۆر ئەڵێ:

مەلا عەلی تۆ پیاوێکیت لە باری گوزەرانەوە زۆر تەواو نیت. ئێمەش ئەمانەوێ پیاوێکی زانای وەکوو تۆ ئەم وڵاتە کەڵکی لێ وەربگرێ. ئێستە ئەوا من دائەنێم بە مامۆستای مەکتەب، مانگی بە ۲٥٠ ڕووپیە. تۆیش بۆ خۆت نەختێ ئەبووژێیتەوە و باری ژیان و گوزەرانت چاك ئەبێ.

مەلا عەلی ئەڵێ: جەنابی مێجەر سوپاستان ئەکەم، من گوزەرانم هەیە. مێجەرسۆن ئەڵێ: ڕەنگبێ بە کەمی بزانی، [با] سێسەد ڕووپیە بێ. مەلا عەلی ئەڵێ: جەنابی مێجەرسۆن خوا ئەفەرمووێ: ﴿فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ﴾ دیسان ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾.

جەنابی مێجەرسۆن من لە مزگەوتەکەی مەڵکەندی نوێژ ئەکەم، هەموو ڕۆژی دێمە دووکانەکەم مۆر هەڵئەکەنم، ئەوا خوا بەوە ڕزقی داوم و پێوە بەڕێوە ئەچم؛ لەوە زیاترم ناوێ. وە ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾.

مێجەرسۆن گەلێکی لەگەڵا خەریك ئەبێ، بێ کەڵك ئەبێ. لە پاشا ئەڵێ: مەلا عەلی ئەوە من تاقیم کردیتەوە بەو دینەی کە من هەمە و تۆ هەتە، قەبووڵت بکردایە ئەموت: ئەوی خراپ و ناشایستەیە لەگەڵیان بکردیتایە تا ئەیانبردیەوە دووکانەکەی خۆت. بۆم دەرکەوت لەم وڵاتەدا هەر مەلا عەلی مەڵکەندی هەیە، وە لە ئێستە بەدواوە تۆ هەر ئیش و کارێکت ئەبێ بە هەر دایەرەیەك بەبێ گیروگرفتی هەموو ئیشێکت بۆ بڕەوێنن.

ئەڵێ: جەنابی مێجەر هیچ ئیشێکم بە هیچ دایەرەیەك نییە؛ ئیشم بە تەنیا دووکانەکەی خۆم هەیە و مزگەوتەکەی مەڵکەندی.

پاش ئەم قسانە هەڵئەستێت و مێجەرسۆن بەڕێی ئەکا تا لە ژوورەکەی دەرئەچێ و زۆر نەوازشیشی لەگەڵ ئەکا.

لە ڕاستیدا مەلا عەلی لەو سەردەمەدا لە باری گوزەرانەوە زۆر پەرێشان بوو؛ بەڵام ئەو تەوەککول و بڕوایە وای لێ کرد، لە پاشا بوو بە دەوڵەمەندێکی باش و چەند حەجی کرد و لە ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی ئەو سەردەمەدا ڕایئەبوارد.

هەندێك لەم بەسەرهاتی مەلا عەلییە خەسرەواغای حاجیاغا بۆی گێڕامەوە.

**١٩٣.** «نەسرەت خانم»ی سەقزی سەرەتا هاوسەری عەبدوڵلابەگی «مصباح» بوو. ئەو نەسرەت خانمە کە لە هەموو ئەو وڵاتەدا بە یەکەم نازدار و کلاولار ناوبانگی دەرکردبوو. لەگەڵ مسباحدا ڕێ نەکەوتن، دوای ئەو مێردێك و دوو و سەرە هاتە سەر «سەیفەدین خان»ی سەقز. سەیفەدین خان کەوتە سەر ئەوە کە بیهێنێ، هەر لەو سەردەمانەدا

برازایەکی عەلیاغای گەورك ـکە ئەم عەلیاغایەش کۆنەمێردی نەسرەت خانم بووـ ئەویش هەر کەوتە سەر ئەوە کە نەسرەت خانم بهێنێت. ئەو کوڕە بەڕاستی جوان و چاك و شۆخوشەنگ بوو؛ تازە پێی نابووە بەهاری گەنجی. هەڕەتی هەرزەکاری بوو؛ وەکوو گوزارشتێکی کوردی هەیە ئەڵێ: خوشکی خۆی ئاشقی ئەبوو. سەیفەدین خان تۆزێ چووبووە ساڵەوە لە چاو ئەودا هیچ نەبوو.

ڕێکەوت شتی سەیر دێنێتە پێشەوە. لەو وەختەدا کە سەیفەدین ئەچێ بۆ خوازبێنی نەسرەت خانم، کوڕەکەی برازای عەلیاغاش هەر ئەچێ بۆ ئەو نیازە. ئەو بە جلوبەرگ و تەدارەکی سەقزی و ئەم بە شەڕواڵ و مراخانی و پشتێنی پەشمی دەستووری گەورکییەوە لەماڵی نەسرەت خانم کۆ ئەبنەوە. سەیفەدین خان هەست ئەکا کە ئەو کوڕە تەدارەکە بۆچی هاتووە، وە ئەگەر بێتە سەر جوانی و تەمەنیش ئەو کوڕە لە جوانی و لە تەمەنیشا لەمی ئەباتەوە. وە ئەزانێ کە نەسرەت خانمیش ئەکەوێتە شوێن ئەو جۆرە شتانە. ئەڵێ: ئەگەر نەکەومە خۆم ئیشم لە دەست چووە.

هەردووکیان دووبەدوو لە ژوورەکەی ماڵی نەسرەت خانمدا دانیشتوون. ژوورێکی تریش بە تەنیشت ئەو ژوورەوە ئەبێ. کە دەرگایان بەسەر یەکەوە ئەبێ، بە جۆرێکی وا ئەگەر لەم ژوورە قسە بکرێ لە ژوورەکەی تر گوێیان لێ ئەبێ. نەسرەت خانمیش هەستی بەوە کردووە کە ئەم دووە لە دڵا بەتەمای ئەون و گوایە بە جۆرێکی نادیار بۆ خوازبێنی ئەو هاتوون. سەیفەدین خان چاوەڕێ ئەوە ئەکا کە نەسرەت خانم ڕێی بکەوێتە ژوورەکەی تەنیشت ئەمانەوە بۆ ئەوە سەری هەندێ قسە دابمەزرێنێ. نەسرەت خانم بە ئیش ڕێی ئەکەوێتە ئەو ژوورە؛ سەیفەدین خان چاوی لێیە، ئیتر بەسەریا ناڕوا. خێرا ڕوو ئەکاتە کوڕەکە و ئەڵێ:

بەڕاستی ئەم شەڕواڵ و مراخانی و شەدەیە شتێکی نایابە و موبارەکت بێ! جوانێکی وەکوو تۆ هەر ئەبێ شتی وا لەبەر کا. ئەتوانم بڵێم: جوانی و شەوکەتی تۆیە وا ئەم جلوبەرگەی جوان کردووە.

نەسرەت‌خانم گوێی لەم قسەیە ئەبێ؛ هەرچەندە بە ئیش هاتبوو بۆ ئەو ژوورە، بەڵام ئیستێکی بۆ ئەکا و گوێ ڕائەگرێ بۆ قسەکە. سەیفەدین‌خانیش ئەزانێ وا ئەو لەوێ خۆی داگرتووە، لەسەر قسەی خۆی ئەڕوا و ئەڵێ:

شەوکەتی وا و جلوبەرگی وا ئەبێ سەر و سوارییەکی چاکیشی هەبێ.
کوڕەش ئەڵێ: خان ئەوە تۆ لوتفت هەیە، هەرچەندە عەیبیشە خۆم بیڵێم، بەڵام لە سایەی سەری تۆوە ئەتوانم بڵێم: لە هەموو «گەورك»دا ڕەنگبێ سوارێکی‌تر وەکوو من نەبێ. لە نیشان شکاندنیشا مەل بە هەواوە ئەخەمە خوارەوە. سەیفەدین‌خانیش ئەڵێ: «الحمد لِلّه»! وەڵڵاهی زۆرم پێ‌خۆش بوو کە ناسراویم لەگەڵ جوانچاك و سوارچاکێکی وەکوو تۆدا پەیدا کرد.

ئەوا نەسرەت‌خانمیش لەو دیوەوە هەروا گوێ لێیە. سەیفەدین تێ هەڵئەچێتەوە ئەڵێ: ئاغەواتی گەورك دەوڵەمەندن و لە هیچ شتێکا ناتەواوییان نییە، بەڵام ئاخ ـ هەرچەندە خۆ ئەوەش پیاوەتییە ـ لە ڕووی ماڵ و ماڵدارییەوە بەرەڵاییەکیان هەیە و هیچ گوێی نادەنێ. خۆ منیش هەر وامە، بەڵام دیسان هەر پێم ناخۆشە. نازانم تۆ لەو ڕووەوە چۆنیت؟
کوڕەش ئەڵێ: دەسا خان، وەڵڵا من وا نیم؛ پووڵ بە پووڵ و شایی بە شایی حساب ئەکەم و نایەڵم لەو ماڵەدا دەنکێ گەنم بە خۆڕایی بڕوا. زەردەخەنەیەکی بۆ ئەکا و ئەڵێ: خان ئەی لەم ڕووەوە جەنابت چۆنیت؟
ئەویش ئەڵێ:

پێم وتی: منیش هەر وەکوو گەورك بەرەڵام؛ لەو ماڵەی خۆما بە بار قەند و چای و برنج و ڕۆن و کووتاڵ ئەخەمە بەردەستیان و ئاگام لە هیچ نییە، مەگەر ئەوەندە نەبێ پێم ئەڵێن: زەخیرە نەماوە، ئەنێرم ئەوەندەی‌تر دێنن و ئەیخەنە بەردەستیان. تەنانەت بۆ ئیش و کاری ملکداریش هەر هەمووی ئەدەمە دەست کابانی ماڵ و ئەو بە سەر ڕائەگات. من تاقەتی ئەو حساب و وردەکاریانەم نییە.

نەسرەت‌خانم گوێی لە هەموو ئەم قسانە بوو؛ وە ئەشی‌زانی کە نیازی ئەم دووە هەردووکیان خوازبێنی ئەوە. لە دڵا وتی: من مێرد بە یەکێك ئەکەم کە حسابم لەگەڵ نەکات. نە یەکێك بێت کە لەسەر هەموو شتێکی ورد و درشت لەگەڵما بکۆڵێتەوە. بڕیاری خۆی لەسەر ئەوە دا کە مێرد بە سەیفەدین‌خان بکا، نەك بەو کوڕە.

قەدەر هێنای لە ئاخرا مێردی بە سەیفەدین‌خان کرد و کوڕیشی لێی بوو. سەیفەدین‌خانیش بەو تەونە کە نایەوە بۆ کوڕەکە بوو بە خاوەنی نەسرەت‌خانم!.

**١٩٤.** لە ساڵی (١٩٤٦) بەدواوە «مدرسە شرافت»ـی ئێرانی هەبوو لە بەغدا لە بەری کەرخ لە «بیت النواب» بەسەر ڕووباری دجلەدا ئەیڕوانی. پاشان ئەو مەدرسەیە هاتە بەری «رصافە»، «شارع رشید» حەیدەرخانە. کتێبخانەیەکی چاکیان هەبوو، من ئەو سەردەمانە لەگەڵ گۆڤاری گەلاوێژ خەریك بووم. جگە لەمەش گەلاڵەی مێژووی ئەدەبی کوردیم دانابوو. لەو مێژووەی پێشوو بەدواوە هاتوچۆی کتێبخانەی ئەو مەدرسەیەم ئەکرد بۆ سەیر کردنی سەرچاوە، هەم بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی، هەم جارجاریش بۆ گەلاوێژ. بەو بۆنەوە ناسراویم لەگەڵ دەستە

و دایەرەی مامۆستاکانا پەیدا کردبوو.

«ئاقای موحەممەد عەلی خوانساری» موفەتتیشی هەموو مەدرسەکانی ئێرانی لە عێراق، گەلێ جار لەو مەدرسەی شەرافەتە یەکمان ئەگرت و قسەمان ئەکرد. جارێك قسەمان سەری کێشا بەلای کورد و زمان و ئەدەبی کوردەوە، هەڵیدایە وتی:

کورد و فارس یەك ڕەگەز و نەتەوەن. وتم: بەڵێ وایە و هەردووکیان لە ڕیشەزمانەکانی ئارین. وتی: زیادە لەمە ئەمانە هەردووکیان بران و لە ئێرانا هیچ جیاییەك لە بەینیانا نییە.

وتم: وەکوو جەنابت ئەڵێیت لەوێ هیچ جیاییەك نییە، بەڵام ئێمەی کورد ئەوا لە عێراقدا گۆڤار و ڕۆژنامەمان هەیە و بە زمانی خۆمان لە قوتابخانەکانا ئەخوێنین و بە زمانی خۆمان کتێب دائەنێین. وتی: بەڵێ، بەڵام لە ئێرانا لەبەر ئەوەکە بران ئەو جیاییە لە بەینیانا نییە؛ هەموو بە زمانی فارسی ئەخوێنن. وتم: باشە برا، بەڵام ئەم برایەتییە هەر ئەبێ بەلای فارسیدا بڕوا؟ بۆچ ئەبێ تۆزێکیشی بەلای برا بچووکەکەدا نەڕوا. خۆ بران! با لە ناوچەکانی کورددا تۆزێ بە کوردی بخوێنن و کەمەکێکیش لە ناوچەکانی‌تریا بە تۆزێك لەم زمانی براییە بزانن و بخوێنن. لە هەموو وڵاتی کوردەواری ئێراندا ئەگەر یەك تاقە قوتابخانە هەبوو کە بە زمانی کوردی بخوێنێ ئەو وەختە من هەموو حەقێکت ئەدەمێ. ئەگینا برای چی و کەی برایەتی وا ئەبێ؟ وا دیارە برایەتییەکەی کورد و فارس لە ئێرانا وەکوو ماڵ بەشکردنی دوو براکەیە!. وتی: ئەوە چی بوو؟ وتم: ئەگەر برا بووینایە، تۆزێك لە زمانی ئەم برایەی خۆتان ئەزانی بۆ ئەوە ئەو کارەساتە لە گۆڤاری گەلاوێژ بخوێننەوە. کە گەیشتە ئەم شوێنە ئەو دوایی بە قسە هێنا و ئیتر منیش لە سەری نەڕۆیشتم.

**١٩٥.** مەلا ئەمینی جەففار هەبوو لە سولەیمانی تا شەڕی گەورەی یەکەمیش هەر مابوو. کەوا و سەڵتەی لەبەرا بوو. جامەدانەی ئەبەست بەسەرەوە، هەندێ جاریش مێزەرەی سپی. کتێبی «جەفر»ەکەی لە باخەڵا بوو، دایئەنا بەناو شارا ئەگەڕا. زۆر خەڵك ئەچوون بۆ لای جەفریان پێ ئەگرتەوە.

جەفر زانیارییەکە کە دەنگوباسی لەمەودوا ئەدا بەدەستەوە. ئەم زانیارییە زانیاری ئەستێرەژمێر نییە؛ عیلمی «ڕەمل»یش نییە. ڕەمل ئەوەیە کە کابرای «ڕەممال» هەندێ «لم» ئەکاتە ناو دەورییێکەوە، ئەو کەسەی کە ئەچێ ڕملی بۆ بگرێتەوە، کابرا لمەکە لەناو دەورییەکەدا پان ئەکاتەوە سافی ئەکا. بە پەنجە چەند خەتێکی پیا دێنێ و پێچەڵپڵووچێکی تێدا ئەکا و پاشان بە کابرا ئەڵێ: ئیشەکەی تۆ ئاوایە و ئاوایە. ئەم ڕەمل گرتنەوەیە وەنەبێ شتێکی بە بناغە بێت، بەڵکوو کابرای ڕەممال بە ئارەزووی خۆی قسە ئەکا و بۆ خەڵك هەڵخەڵەتاندنە. بەم ناوەوە نانێکی پێوە ئەخوا.

بەڵام «جەفر» وا نییە، بناغەی هەیە، بەڵکوو عیلمە. مەلا ئەمینی جەففار کە کتێبەکەی ئەگرتەوە بەردەمۆرەکەی ئەهێنا. ئەم بەردەمۆرەیە شەش پاڵووی هەبوو لە وێنەی قاڵبە سابوونێکا؛ بەڵام بچووك بوو. تۆزێ لە نۆکێ گەورەتر. لە هەر لایەکەوە حەرفێك نووسرابوو. هەر جارە کە هەڵیئەدا ئەو حەرفەی کە ئەهێنایە قەڵەمێکی بە دەستەوە بوو، کاغەزی لە بەردەما بوو، حەرفەکەی ئەنووسی. ئەمجا هەڵیئەدایەوە حەرفێکی تری ئەهێنا، وەیا هەر حەرفی پێشووی ئەهێنایەوە. ئەویشی لەپاڵ ئەوی ترا ئەنووسی، تا بیست جار ئەم ئیشەی ئەکرد. پاشان حەرفەکانی لێك ئەدا تا وشەی لێ دروست ئەبوو، ئەم وشانەی بە دێڕێکی تر ئەنووسی.

دوای ئەمە ئەو کەلیماتانە کە سێ حەرفی بوونایە و مەعنایەکی بدایە ئەگەر لە کەلمەکەی تەنیشتی حەرفێکی بخرایەتە سەر مەعناکە ئەبوو بە شتێکی‌تر. کەلمەکەی تەنیشت، ئەوا حەرفێکی لێ کەم بووەوە لە کەلەمەکەی تەنیشتی، ئەوە بەلای چەپەوە، حەرفی بۆ ئەهێنا و ئەیخستە سەری تا ئەبوو بە کەلمەیەکی مەعنادار. لەسەر ئەم جۆرەش دێڕێکی‌تری دروست ئەکرد. بەم تاوتوە کە ئەیکرد، پێنج شەش دێڕ دروست ئەبوو؛ پاشان کتێبەکەی ئەکردەوە سەیری ئەو وشە و دێڕانەی ئەکرد و سەیری کتێبەکەی ئەکرد. کتێبەکە ئەیوت: ئەگەر فڵانە وشە لەگەڵ فڵانە وشەدا بوو، وەیا چەند وشەی ئاوا و ئاوا کەوتبوونە پاڵ یەك، مەعناکەی ئەوەیە ئەو ئیشە ئەوەیە و ئاوایە. لە ڕاستیدا ئەو ئیش و مەرامە نادیارە هەر شتێك ببوایە ڕوونی ئەکردەوە و وەکوو هێلکەی پاککراو ئەیدا بەدەستەوە. مەلا ئەمینیش ئیتر مەبەستەکەی ئەوت بە کابرا. لە ئەنجاما ئەو ئیشە وەکوو جەفرەکەی وتبووی هەر وا ئەهاتە پێشەوە. بۆ ئەم جەفرە ئەتوانرێ بوترێ مەلا ئەمین یەکەمین کەس بوو لە سەردەمی خۆیا و لە چەرخی خۆیا.

١٩٦. جاران لەو کوردەوارییە ـ نەوەك جاران بەڵکوو ئێستەش ـ یەکێك کە ژنی ئەهێنا و نەئەبوو بە زاوا، ئەیانوت ئەمە «بەستراوە». کابرا ئەکەوتە گەڕان بۆلای شێخ و مەلا بۆ نوشتە کردن و چاری ئەم دەردەی کە بەڵکوو بکرێتەوە.

«عاسەبیجەڕێنە» هەبوو لە سولەیمانی کە ئیشی هەر ئەوەبوو: بەستراوی ئەکردەوە. کابرای بەستراو کە لە هیچ لایەك هیچی بۆ نەئەکرا، بەناوبانگەی عاسەبیجەڕێنە ئەهات بۆ سولەیمانی و ئەچوو بۆلای

ئەیوت: میمکە عاسە! بیکە وە خاتری خوا چارێکمان بکە. میمکەعاسەش خۆی تەنگ ئەکردەوە ئەیوت: بڕۆن باوکم، بۆ وازم لێ نایەنن. بەهۆی جەزرەبەی جنۆکە و شەیتانی ئێوەوە ئەوەتە هەر ئێسقانەکەم ماوە. کابرا کە گوێی لەمە ئەبوو ئەوەندەیتر شێرگیرتر ئەبوو، دەستی ئەپێچان بە داوێنیا ئەیوت: بیکە بە خاتری ئەو خوایە کە ئەو بەهرەیە داوە وە تۆ ئەگەر چارمان نەکەی. عاسەش ئەیوت: بڵێم چی، باشە؛ با ئەم جارەش بۆ ئێوە بێ.

عاسە دوو ژووری لە خانووەکەیا هەبوو، کابراش کە ئەهات بە خۆی و ژنەکەیەوە ئەهات. ئەمجا میمکە عاسە لە یەکێك لە ژوورەکانی جامێ ئاوی ڕوونی ئەهێنا چارۆکەیەکی ئەهێنا ئەیدا بەسەر جامە ئاوەکەدا، دارێکی ئەدایە ژێر چارۆکەکە. چارۆکە وەکوو چادری لێ ئەهات بەسەر ئاوەکەوە. ئەمجا کابرای بەستراو و ژنەکەی ئەهێنا تۆزێ نزیك لە ئاوەکەوە دایئەنان، خۆی ئەچووە ئەولای چارۆکەکەوە بە جۆرێ دائەنیشت کە چارۆکەکە بکەوێتە بەینی ئەو و ژن و پیاوەکە. مەقەڵییەکی ئاگریشی لەولای خۆیەوە دائەنا، قانگی ئەکرد بەسەرا، کۆترە قەڵەمێك و تۆزێ کاغەزە شرەشی لە تەنیشت خۆیەوەدا ئەنا.

لە پشت چادرەکەوە دەمی ئەدا بە یەکا هەندێ شتی وەکوو: «جۆڵوو، تەیپوو جادوو، گالێك» بێنەوە بزانم. کابرا و ژنەکە ئەوەندەیان ئەزانی شڵپەشڵپ و جرووکەجرووکێك لەناو جامە ئاوەکەوە پەیدا ئەبوو. ئەمجا باجی عاسم هەر لە پشت پەردەکەوە ڕووی ئەکردە جرووکەکە و ئەیوت:

قسە بکە کێ ئەحەی بەستووە؟ (ئەگەر کابرا ناوی ئەحە بوایە ئەگەر شتێکیتری ناو بوایە بە ناوەکەی خۆیەوە ئەیوت) جرووکە و شڵپەکە کز ئەبوو، ئیتر دەنگی نەئەهات. باجی عاسم تووڕە ئەبوو ئەیوت: مەلعوون

قسە بکە لە منی مەشارنەوە شڵپە و جرووکە ئەکەوتنەوە دەنگ. ئەمیش ئەیوت: ئێ! کام چاڵ؟ کەی؟ ئەوا جرووکەش هەر جرووکەی دێت و ئاوەکەش هەر شڵپەشڵپ ئەکا. ئەیوت: «بۆم بێنن». ئەیوت: چۆن ناتوانن؟ ئەیوت: ڕێگا دوورە یا نزیکە، چاڵ قووڵە یا قووڵ نییە، من ئەمانە نازانم. ئەبێ هەر ئێستە بۆم بێنن. ئەمجا ئەیوت: ئەو مەلعوونە ناوی چی و کوڕی کێ بوو؟ جرووکەکە تۆزێ دەنگی نزم ئەبووە، ئەیوت: ها تۆڵپەی کوڕی گۆڵپە؟ ئەیوت: ئەی چی؟ ها شڵخەی کوڕی ملخە! چیرەیەکی لە قەڵەم و کاغەزەکەوە ئەهێنا و ئەیخستە ناو مەقەڵییە ئاگرەکە و ئەمە گوایە ناوی شڵخەی کوڕی ملخەی نووسی و سووتاندی.

لەو وەختەدا کە کاغەزەکەی ئەخستە سەر مەقەڵەییەکە و باجی عاسم خۆیشی دەنگی لێوە ئەهات و ئەکەوت و ئەکەوت بەلادا. کە ئەمە لەبەر دەستی جنۆکە بێهۆش بوو. کوڕ و ژنە گوێیان لە ئەم هەموو کارەساتەیە.

جرووکە و شڵپە ئیتر بێدەنگ ئەبوو، باجی عاسە ئەهاتەوە هۆش. چەند تاڵە موو وەیا چەقۆیەکی پێشتر حازر کردووە هەڵئەستا ئەهاتەوە بۆلای کوڕ و ژنەکە ئەیوت:

کوڕم، شڵخەی کوڕی ملخە کە لە خێوەکانی کێوی قافن، لە وەختی مارەبڕینتانا وەیا ئەیوت لە نیوەشەوی دوای مارەبڕینتانا تۆی بەستووە و فووی کردووە بەم مووانەدا و کردوونی بە گرێکوێرە، خستوونیە چاڵی مەغربەوە؛ ـ بۆ یەکێکی‌تر ئەیوت ئەفسوونی خوێندووە بەم چەقوەدا و دەمی ناوەتە یەك، خستوویەتە چاڵی جابولقاوە ـ!

من ئەو خێوانەم بانگ کرد کە لەناو ئاوەکەدا بوون، تێم‌خوڕین کە بچن بیهێنن، هێنایان ئەمە مووەکانە کراونەتەوە. ئەوە چەقۆیەکەیە کراوەتەوە، ناوی ئەو شەلخە مەلعوونەشم نووسی خستمە سەر ئاگرەکە و سووتاندم.

کە ئەمسووتان عەشرەتی شەلخە هەموو دەوریان لیٚ دام، من دوعای ئەبوودوجانەم لەبەر بوو خوێندم؛ ئەگینا ئەیانکوشتم. بەڵام لەبەر ئەوە کە ئەوەندە ناشیرین بوون، بێهۆش کەوتم. هەموو ئەو عەزیەت و ئازارانەیە، بۆیە من هەروا چلۆچێوەکەم ماوە. دە هەستن بچنە ئەو ژوورە بەبیٚ ترس ئیشی خۆتان بکەن.

کابرا پەلی ژنەکە ئەگریٚ و ئەچنە ژوورەکە، دڵی بەهێزە؛ چونکە گوێی لە هەموو شت بووە و کراوەتەوە. شاپلیتە ئەکەوێتە کار و ڕووباری ماوەران ئەڕژیٚ. سەرباری ئەو دیارییە کە پێشتر هێناویانە بۆ باجی عاسم، هەندیٚ پارەیتریشی بە دەستخۆشانە بۆ دائەنێن. ماڵاوایی ئەکەن و لەگەڵ هەڵگرتنی پەڕۆی بووکێنی ئەچنەوە بۆ ماڵەوە.

نووسینی ئەم باسە تەنیا بۆ دەرکەوتنی «عاسەبیجەڕێنە»بوو. دوور نییە هەندیٚ کەس بڵێن: مچەی حەبیٚ کشمیش و عاسەبیجەڕێنە بۆچی ئەبیٚ بنووسرێن؟ منیش ئەڵێم ئەگەر ئێمە تا ئێستە لە هەموو ڕوویەکەوە شتمان بۆ بنووسرایە، ئەدەبەکەمان زۆر زۆر دەوڵەمەند ئەبوو. ئەگەر ئێستە نرخی ئەمانە نەزانریٚ، ڕۆژێك ئەبیٚ کە نرخیان زۆر چاك ئەزانریٚ.



# بۆ مێژوو

**١٩٧.** جەمال عارف بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵی (١٩٣٢) لە سولەیمانی بە ناوی مەولوودییەوە کۆبوونەوەیەك لە مزگەوتی گەورەدا کرا و هەندێ قسە و باسی نهێنی لەو کۆبوونەوەیەدا لەگەڵ چەند کەسێکا کرا. شێخ مەحموود کاغەزێکی بۆ شێخ ئەحمەدی بارزانی و هەندێ لە سەرۆك عەشرەتەکانی وڵاتی بادینان نووسی، کە ئەوان لەو وڵاتەوە شێخیش لە وڵاتی ئەملا، قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا و بە هەموویانەوە بچن بەگژ حوکوومەتی ئەو وەختەدا بۆ وەرگرتنی حەقی کورد. وتی: ئەم کاغەزە درا بە من کە من بچم بیگەیەنم و وەڵام بێنمەوە. وتی: ڕۆیشتم بە بێدەنگی و چاوم بە گەلێ لەو ڕەئیس عەشرەتانە کەوت و کاغەزم دانێ.

ماجد مستەفا ئەو وەختە قائیمقام بوو لە ئامێدی، بە ناوی هاووڵاتی و زابتی و دۆستایەتییەوە بووم بە میوانی ئەو. پێی وتم: جەمال چۆن هاتووی بۆ ئەم وڵاتە؟ وتم: بۆ گەڕان و بۆ دیدەنی تۆ. یەك دوو ڕۆژی تری پێچوو، دیسان لێی پرسیمەوە: چۆن هاتووی بۆ ئەم وڵاتە؟ منیش هەر بەو جۆرە وەڵامم دایەوە؛ وە مانەوەشم ئەو چەند ڕۆژە لەوێ بۆ ئەوە بوو کە ڕەئیس عەشرەتەکان هەموو پێیان وتم: ئێمە لەگەڵ ئەم بزووتنەوەیەداین. پاش چەند ڕۆژێك وەرەوە جوابی کاغەزەکەشت ئەدەینەوە، بیبەوە بۆ شێخ مەحموود.

وتی: ئەوەندەم زانی ماجد دەستی برد یەکە یەکە ئەو کاغەزانەی کە

من هێنابووم بۆ سەرۆکی عەشرەتەکان و زۆر بە نهێنیش ئیشەکەم گرتبوو، دەری‌هێنا و خستیە بەردەستم. وتی: هەر وا لە شوێنەکەی خۆم وشك بووم. بەشوێن ئەوەدا دەستی برد کاغەزێکی‌تری دەرهێنا کە لەلایەن «مُتَصرّف»ـی مووسڵەوە نێرراوەتە سەر ئەو، کە بەو ناوەوە قائیمقام بمگرێ، بە باڵبەستی بمنێرێ بۆ مووسڵ و لەوێوە بمنێرن بۆ بەغدا.

وتی: کە ئەمەم دی هەر بە جارێ وشك بووم. وشك بوونەوەکەم لە ترسی گرتنەکە نەبوو، لەوە بوو کە من ئەم ئیشەم زۆر بەنهێنی گرتووە، کەچی بەم جۆرە بڵاو بووەتەوە. وتی: ماجد پێی وتم: جەمال ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی وەرەوە ئەوا ئێستە من پیاوی حوکوومەتم، لەم دەقیقەیە زیاتر نییە، تفەنگ ئەکەمە شانم، ئەوا ئارارات دیارە، پێکەوە ئەچین و ئەدەینە شاخ. چیمان پێ بکرێ ئەیکەین. خەڵکی‌تریش لەوێ هەیە لەگەڵ ئەوان دەست ئەکەین بە ئیش‌کردن. تۆ هاتوویت بۆ لای ئەمانە؛ ئەمانە هەموو درۆ ئەکەن، هەموویان لە ژێرەوە لەگەڵ حوکوومەتن. یەکەیەکە ئەو کاغەزە نهێنییانە کە تۆ هێناوتە بۆ ئەوان، هەموویان هێناوە بۆ من.

بە وەشەوە نەوەستان، خەبەری ئەم هاتنەتیان گەیاندۆتە موتەسەڕیفی مووسڵ. ئەویش بە فەرمانێکی ڕەسمی کردوویەتە سەر من کە بتگرم و بە باڵبەستەیی بتنێرم. ئەمەیە حاڵی ئەم سەرۆکانە. بەبێ چرپە بەو شوێنەدا کە هاتوویت هەر بەو شوێنەدا بگەڕێوە و خەبەرەکە بەرەوە بۆ شێخ؛ منیش ناتگرم، ئەگەر سەریشم تێدا چووە. وتی: هەندێ پارەی دامێ؛ خۆی لەگەڵم هات تا قەراخی شارەکە بەبێ ئەوە پۆلیس بزانێ ڕەوانەی کردم خستمیە سەر لاڕێگەیەك و وتی: لێرەوە بڕۆ. وتی: تا لە سنووری ئامێدی دەرچووم هەر بە لاڕێگا و بە ترسەوە ئەهاتم. بەو جۆرە

گەیشتمەوە وڵاتی سولەیمانی و چوومەوە بۆلای شێخ و کارەساتەکەم تێ گەیاند.

## شێخی بورهان

**١٩٨.** «بورهان» گوندێکە لە وڵاتی موکریان. شێخێکی لێ بووە بە ناوی «شێخی بورهان»ـەوە ناوی دەرکردووە. ناوە ئەسڵییەکەی «یووسف» و لەقەبی «شمس الدّین» بوو. سەردەمی ژیانی سەدەی نۆزدەهەم بوو. شێخی بورهان یەکێك بووە لە شێخە پایەبەرزەکانی سەر بە بنەماڵەی «شێخانی تەوێڵە» لە کوڕی ئاگردانی «مەولانا خالدی نەقشبەندی».

پایەی شێخی بورهان شێخی ڕاستەقینە بووە. خۆی پیاوێکی دەوڵەمەندی بەڕاستی دەوڵەمەند بووە. دەوڵەتەکەی لە کۆششی خۆی و لە میراتی باو و باپیریـەوە بۆ ماوەتەوە. چاوی لە دەستی خەڵك نەبووە؛ نانی داوە بە خەڵك، نانی کەسی وەرنەگرتووە.

لە ماڵی تایبەتی خۆی ٣٠ مانگا، پێنج جووتەگا و دە ئێستری تەرخان کردووە بۆ خانەقا. گاوان و جووتیار و دارکێشی بۆ ڕاگرتوون. شیری ئەم مانگایانە بۆ ماست و دۆی ئاوەن و ڕەوەنی مریدانی خانەقا، بەرهەمی جووتەکانیش بۆ خانەقا. ئێسترەکانیش هەموو ڕۆژێ تێڕوان بۆ دار و سووتەمەنی خانەقا.

ئەو عالەمە لە دوور و نزیکەوە هاتوون نان و شۆربا و هەموو شت حازر بووە. چەند لەوێ مابێتنەوە بە زکر و فیکرەوە ڕایانبواردووە. ئەگەر مریدەکانیش شتیان هێنابێ، پیاوی تایبەتی هەبووە لێی وەرگرتوون، هەر لە خانەقادا عەمار هەبووە براوەتە ئەوێ و دەرخواردی مریدان دراوە بەبێ ئەوە تێکەڵاو بە ماڵی شێخ کرابێ.

ڕابوردنی خۆیشی وا بوو: گوێدرێژێکی هەبوو، هەموو ڕۆژ سواری بووە چووە بۆ سەر ڕەز و زەویوزاری خۆی. خۆی بە دەستی خۆی بژاری ڕەزی کردووە، بێڵکاری کردووە. بە دەستی خۆی گەنمی وەشاندووە، ئاوی داوە و دروویەتیەوە، شەنوبای کردووە. بردوویەتە ئاش و هاڕیویەتی. لەوە لە ماڵەوە نانی بۆ دروستکراوە وەکوو بڵێیت دائیما لە ڕیازەت و چەوسانەوەی نەفسدا بووە. زۆرتر خواردنی لەوە، نان و شۆربایە بووە کە خۆی بە دەستی خۆی هێناویەتە دەست. میوەی ئەخوارد، ئەویش هەر لەوە کە خۆی بە دەستی خۆی لە ڕەزەکانا ئەیهێنایە ئەنجام. هەموو دەم دەرزی و دەزووی پێ بوو، جلەکانی خۆی پی ئەدرووەوە. بە هیچ جۆر ئەرکی نەئەخستە سەر کەس. لە کۆڕی «مُراقَبە»ی سۆفییەکانا ئەچوو سەری ئەنا بە سنگیانەوە موراقەبەی ئەکردن. هەموو ساڵێکیش چلەی ئەکێشا. ئەمە بوو شێخی بورهان.

.١٩٩ هەتا جەنگی یەکەمی جیهانیش (١٩١٤-١٩١٨) لەو کوردەوارییە زۆر جار جەماعەتی مزگەوت سەیریان ئەکرد: یەکێ لە ئەهلی جەماعەت دیار نییە؛ وەیا لە گوزەری بازاڕ تەماشایان ئەکرد: یەکێ لە دراوسێ دووکانەکان دیار نییە و دووکانەکەی داخراوە؛ ئەچوون بەسەر وەختیەوە بزانن بۆچی دیار نییە؟ کە ئەچوونە ماڵەکەوە خەبەریان ئەپرسی، ئەیوت: ئەوی ڕاستی بێ هەر یەك کراس و دەرپێ وەیا یەك کەوام هەیە، چڵکن بوو، شۆردیان هیچیتر نەبوو لەبەری بکەم؛ لە ماڵەوە دانیشتم تا وشك ئەبێتەوە بیکەمە بەرم و بێمە دەرەوە!.

.٢٠٠ «شـــارەزوور»، جوغرافیزانەکانی پێشوو وتوویانە: لە کلکەشاخەکانی هەورامانەوە دەست پێئەکات تا وڵاتی

کەرکووك. بەڵام لەم ئاخرەدا شارەزوور لەناو کورددا وا ناسرا کە لە بناری هەڵەبجەوە تا سولەیمانی شارەزوورە.

جا ئەم شارەزوورە کە ئەگەیشتە سولەیمانی هەتا ساڵانی ١٩٢٥ گیا و قامیشەڵانێك بوو، سوار لە ناویا ون ئەبوو. سەردەمی هەرە پێشووی نە، بەڵام لە مێژووەکانی دواییدا لەبەر ئەوە ڕێبازی جاف بوو بۆ «شلێر» و «ناوخوان»، ئاوەدانی زۆر کەم بوو. لەم لایەوە «عەربەت» و «بێستانسوور» هەبوو، عەربەتەکەش لە دووپشکە ناقۆڵاکانی، مەگەر ئەهلەکەی خۆی نەبێ، کەسی‌تر نەیئەوێرا شەوی تیا ڕۆژ کاتەوە. دووپشکی عەربەت بیدایە بە هەرکەسێکەوە ئەو کەسە ئەگەر خۆی پیس بکردایە ڕزگاری ئەبوو، ئەگەر وا نەبوایە ئەیکوشت!.

٢٠١. هەتا سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمە و بەڵکوو تا جەنگی جیهانی یەکەم، «سنە» یەکێ بوو لە شارە بەناوبانگەکانی کوردستان، کە بە پیشەسازی دەستی، گۆی هونەری بردبووە؛ هونەرمەندەکانی ئەوێ ئەهاتن لە داری گوێز: قوتوو جگەرە، سینی و قەڵەمدان و کاسەیان دروست ئەکرد، بە نەخش و نیگاری نایاب ئەیانڕازاندەوە. زیاتر هونەرمەندییەکە لە بۆیەکارییەکەیا بوو. ئەو ڕەنگ و بۆیەیە بە جۆرێ ئەکرا کە چوونەوەی نەبوو. ئەم ئەوزارانە کە ئەو هونەرمەندانە ئەیانکرد، ئەبرایە وڵاتانی دەرەوە و ئاورووپا. عەنتیکەسێنەکان ئەیانکڕی، پیاوانی دەوڵەمەندی هۆگری عەنتیکە، بە پارەیەکی زۆر وەریان ئەگرت؛ نەك بۆ بەکارهێنان، بەڵکوو بۆ ئەوە کە لەناو جامخانە و لەسەر مێزی دیواخان دایبنێن بۆ سەیر کردن و تەماشا کردنی میوان و هاتوچۆکەرانی.

◇◇◇

# تاڤگەی ئێلاخ

٢٠٢. مەلا حەسەنی شاتری بۆی گێڕامەوە وتی: عێل سەرەوژوور ئەچوو بۆ کوێستان، منیش ئەچووم بۆ «کفری». پیاوێکی جاف هەبوو «ڕەوە»ی ناو بوو، لە ڕێگادا تووشم بوو؛ ئەویش هەر بۆ کفری ئەچوو. وتی: مەلا حەسەن تۆ خانەخوێت هەس؟ وتم: ئا. وتی: سابەخوا براکە من نیمە، منیش هەر تێم بۆ ماڵی خانەخوێکەی تۆ. وتم: باشە.

گەیشتینە ناو شار، کابرایەك ترۆزی ئەفرۆشت. کۆمەڵ کۆمەڵی کردبووە و بانگی ئەکرد: کۆمەڵی بە پێنج قرۆش. ڕەوە لێم دوور کەوتبووە؛ کە گوێی لە کابرای ترۆزیفرۆش بوو، هەر لە دوورەوە لەو ناو بازاڕەدا بە دەنگێکی قایم بانکی کرد: «هۆ مەلا حەسەن! مەلا حەسەن! ئا پێنج قرۆشێکم بۆ بسێنە». منیش ترۆزییەکەم بۆ کڕی و شەوێ چووینە ماڵی خانەخوێکەی من.

شەو ئەوا دانیشتووین، کوتوپڕ کابرا لە ماڵەکەدا نێرگەلەیەکی بە مارپێچەکەیەوە بەرچاو کەوت، هەر ڕاست بووەوە هاواری کرد: «کوڕگەل! ئای کەوە کیفن خواردمانی». نێرگەلە و مارپێچی دایە بەر گۆڵ.

لەمە بووینەوە و دانیشتبووین، ئاوێنەیەك بە قەد دیوارەکەوە بوو، منالێکیشمان لا دانیشتبوو. منالەکە لەناو ئاوێنەکەدا لە «ڕەوە»وە دیار بوو، کە دیاریش بوو بە سەرەولێژی دیار بوو. ڕەوە هەر چاوی بەمە کەوت،

پەلاماری منالّی ناو ئاوێنەکەی دا و وتی: «یا غەوس! نەتکردوێ یا غەوس نەتکردوێ». لای وا بوو ئەمە ئەکەوێتە خوارەوە.

٢٠٣. مەلا برایمی «کەلۆس» هەبوو، شەوێك لە خەویا خەریکە سلەگوویەك ئەخوا! کە ئەکەوێتە بەیانی لیرەیەك ئەدۆزێتەوە. ئەمجا هەموو نوێژێك دەستی بەرز ئەکردەوە و دوعای ئەکرد ئەیوت: «خوایە هەموو شەوێ سلەگوویەکم دەرخوارد دەی!».

٢٠٤. ساڵێك لە سولەیمانی بێبارانی هات بەسەرا و خەڵکەکە زۆر شڵەژان، کەوتنە نوێژەبارانە. نوێژەبارانەش لە دەرەوەی شار ئەکرێ؛ مەلا و حاجی و پیاوی پیر و منالّی ساوا و مالاّت لەگەڵ خۆیان ئەبەن، دەست ئەکەن بە نوێژکردن و پاڕانەوە لە خوا کە بارانیان بۆ ببارێنێ.

خۆت ئەزانی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی حافزی زۆری لێیە، حافزەکانیش لەگەڵ خۆیان ئەبەن بۆ ئەم نوێژ و نزا و پاڕانەوەیە بۆ ئەوە بەڵکوو خوا ڕەحم بەم هەژار و بێچاو و ساوا و مالاّتە بکا و باران ببارێنێ. ئەو دەشتە لەبەر دەنگی مەلا و نزای پیر و باڕە و قاڕەی مەڕ و گریانی منالّ، ئەبێ بە ڕۆژی قیامەت. هەریەکە بە جیا هاوار ئەکا و ئەپاڕێتەوە. سەرە هاتە سەر حافزەکان بۆ ئەوە دەست بکەن بە دوعا و پاڕانەوە. لە ناویانا مەلا سەعیدێکی بانەیی هەبوو، هەستا گۆچانەکەی گرت بە دەستەوە و پێشکەوت و دەستی بەرز کردەوە و وتی:

خوایە! تۆ ئەزانی ناو شاری سولەیمانی کە باران ئەبارێ ئەبێ بە چ قوڕ و چڵپاوێك؟ ئێمەش کە کوێرەکانی مزگەوتی گەورەین لەناو قوڕوچڵپاوی کۆڵانەکانا حاڵمان حاڵی سەگە و هەر تەپوکوتمانە. جا تۆ هیچ گوێ مەدە بە فلّتەفلّتی ئەمانە، بیکە بە خاتری گەورەیی خۆت و

خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ دەرگای ئاسمان ببەستە و مەیەڵا تنۆکی باران بێتە خوارەوە. حاڵی ئێمە بە تەواوی شڕ ئەبێ و ئەو وەختە خۆت ئەزانی چیت پێ ئەکەم!.

٢٠٥. کتێبێك هەیە «جَمعُ الجَوامِع»ی پێی ئەڵێن. ئەم کتێبە باوی هەبووە لەناو فەقیەکانا ئەیانخوێند. حاشیەیەك بەسەر ئەم کتێبەوە هەیە «بَنّانی» پێ ئەڵێن. خاوەنی ئەم بەنانییە هەروەخت زۆر تێ‌گیرابێ دەستی کردووە بە سوێند خواردن ویستوویە بە سوێند قسەکەی خۆی بسەپێنێ بەسەر خەڵکا.

شێخ بابەعەلی تەکیەیی لە سولەیمانی دەرزی ئەم کتێبەی بە فەقێیان ئەوتەوە، هەرکاتێ کە ئەگەیشتە سەر سوێندەکانی بەننانی پشتێنەکەی لێ ئەکردەوە، پاڵی لێ ئەدایەوە و ئەویت: ئیش کە گەیشتە سوێند، ئیتر ئەوا من پەکم کەوت. دەستی ئەخستە سەر دەمی و ئەیوت: «ئم»!.

٢٠٦. کابرایەکی «تەرخانی» لەو کوێستانە «خوێ»ـیان نەما بوو «گا»شیان لەماڵەوە نەبوو. کەرێکی دایە پێش خۆی چوو بۆ خوێڵێن، گوێدرێژی بار کرد و لەولاوە گەڕایەوە. شەوی بەسەرا هات، کردی بە باران، خوێکە هەمووی توایەوە. کابرا باران سەری لێ تێك دا! گورگ هات کەرەکەشی خوارد؛ پاشان کردیە برووسکە. جا ئیتر کابرا ئەیوت:

«ئەی گووت لێ نەوارێ! بارانەکە خوێکەمی تواندەوە، کەرەکەم گورگ خواردی، ئێستە خەریکە چرا هەڵئەکا ئێژێ خۆیشتم کەرەگە. ئەی برا بۆ واز نایری هیچ وە بزانی باوکتم کوشتگە؟!».

٢٠٧. شێخ حسێنی قەرەداغی هەبوو بۆی گێڕامەوە وتی: ئەوە ئەمەوێ بچمەوە بۆ ماڵەوە، تووشی دروشکەیەك بووم. بە

دروشکەچییەکەم وت: بە چەند سوارم ئەکەی؟ وتی: بە دوو ڕووپیە. وتم: پیاوی چاك بە، زەلامێك بە ڕووپیەیەك سوار ئەکرێ، ئێستە چۆن ئەڵێی دوو ڕووپیە؟ وتی: ئاخر تۆ زۆر زلی! لە دوو زەلامیش زلتری. وتم: ئەمە قسە نییە تۆ ئەیکەی، هەروەکوو خەڵکیتر دوو دەستم هەیە و دوو قاچم هەیە و دوو چاو و دوو گوێ، ئیتر چیم زیاترە لە خەڵك؟ وتی: بە هەرجۆر بوو لەگەڵ ئەوەش کە خەڵکیتری بە ڕووپیەیەك سوار ئەکرد، بە ڕووپیە و نیوێ ڕێ کەوتین. هاتم سوار بم وتی: «نەکەی، بچۆ لە پشتی عەرەبەکانەوە بسووڕێوە و وەرە بە دزی ئەسپەکانەوە خۆت بکوتەرە ناو دروشکەکەوە؛ ئەگینا ئەسپەکان چاویان پێت بکەوێ بە دوو زەلامت تێئەگەن نایەڵن!».

**٢٠٨.** حاجی دەروێش هەبوو بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵێك لە خێڵێکی کەماڵەیی بووم. خێڵەکە گاوانیان نەبوو، خەڵکەکە خۆیان بە نۆبە هەر ڕۆژی یەکێکیان ئەچوونە لای گالەکە. وتی: کابرایەکی پێکوڕەی پیر هەبوو، ڕۆژێك نۆبە کەوتە نۆرەی ئەوەوە. گاگەلی دایە پێش و چوو بۆ لەوەڕ. ئەگەنە شوێنی لەوەڕ، گاگەل خەریکی لەوەڕ ئەبێ و ئەمیش بۆی ڕائەکشێ خەوی لێ ناکەوێ، هەتاوەکەی تۆزێ گەرم ئەبێ، کابراکەی ئەکەوێتە نزگەرە. مرخ لە جاشوولەیەك خۆش ئەکا بۆی ناگیرێ. ماکەری دایکی جاشکەکە ئەداتە بەر. ئێوارە گاگەل دێنێتەوە، ماکەرەکە بە خۆی و جاشکەکەیەوە ڕوو ئەکاتەوە ماڵی خاوەنی. کە ئەگەنە نزیکی ماڵ، جاشەکە بە دەوری دایکەکەیا هەڵئەپەڕی و جووتەی ئەوەشاند و غارغارانی ئەکرد. وتی: گوێم لێ بوو کابرا ڕووی کردە ماڵی خاوەن کەر و وتی:

جاشکەکەتان ئەزانێ ئیمڕۆ زەماوەنی دایکی بوو، بۆیە وا کەوتگە خۆشی خۆشی و جامبازە.

٢٠٩. لە مزگەوتێك لە بەغدا وەیا بڵێینی لە مزگەوتەکەی لای خۆم، ئەوا نوێـژی نیوەڕۆیـە خەریکی دەستنوێژ شتن بووم. دوو زەلامی کوردی ئەو بناری کفرییە هاتن بۆ نوێژ. یەکێکیان ڕیشی سپی و ئەوی کەیان لە دەوری سی ساڵانێکا ئەبوو. ئەمی سی ساڵەکە زۆر تەنگەتاو بوو، مەسینەیەکی هەڵگرت و چووە سەر ئاودەستەکە و ڕیش سپییەکە لە دەرەوە وەستابوو. کابرا کە هاتە دەرەوە ڕیش سپییەکە پێی وت: بۆچی مەسینەکەت نەهێنایە دەرەوە؟ ئەویش وتی: ئەوەندەی ئاو تیایە ئەگەر هەر میز بکەی بەستە. مامەی ڕیش سپی هەر وا لەسەر خۆی وتی: «ئاخر ئەترسم گوویشم وە ڕیشەوە بویٚ». ئەویش وتی: «کوڕە قیروسیا ئەگەر وە ڕیشیشتەوە بویٚ هەر بەستە!».

٢١٠. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: شێخ محەمەدێك هەبوو لە تەکیەی لای ئێمە (تەکیەی قەرەداغ) پێیان ئەوت: شێخ «محەمەدە جنۆکە». ئەم شێخ محەمەدە نوشتە و شتی ئەکرد. پارچە زەوییەکی هەبوو لەگەڵ پیرێژنێکا هاوسنوور بوون. بە درێژایی زەوییەکە بەردیان دانابوو بە بەینا بۆ ئەوە زەوی هەردوو لایان دیار بیٚ.

ئەمجا ئەم شێخ محەمەدە جنۆکەیە هەموو ڕۆژیٚ ئەچووە سەر بەردی سنوورەکە، قورعانێکی هەبوو لەگەڵ خۆی ئەیبرد ئەیگرت بە بەر چاویەوە و بەدەم گەڕانەوە قورعانی ئەخوێند، لە ژێریشەوە بە پیٚ پێی ئەدا لە بەردی سنوورەکە و ئەیخشانە ناو زەوی پیرێژنەکەوە. بەم جۆرە گەلیٚ لە زەوی ئەو پیرێژنەی خستبووە سەر زەوییەکەی خۆی؛ بەڵام ئەم شێخ محەمەدە لە ئەنجاما بە نەخۆشی «سیل» مرد و دنیا و زەوییەکەی بەجیٚ هێشت!.

دروشکەچییەکەم وت: بە چەند سوارم ئەکەی؟ وتی: بە دوو ڕووپیە. وتم: پیاوی چاك بە، زەلامێك بە ڕووپیەیەك سوار ئەکرێ، ئێستە چۆن ئەڵێی دوو ڕووپیە؟ وتی: ئاخر تۆ زۆر زلی! لە دوو زەلامیش زلتری. وتم: ئەمە قسە نییە تۆ ئەیکەی، هەروەکوو خەڵکی‌تر دوو دەستم هەیە و دوو قاچم هەیە و دوو چاو و دوو گوێ، ئیتر چیم زیاترە لە خەڵك؟ وتی: بە هەرجۆر بوو لەگەڵ ئەوەش کە خەڵکی‌تری بە ڕووپیەیەك سوار ئەکرد، بە ڕووپیە و نیوێ ڕێ کەوتین. هاتم سوار بم وتی: «نەکەی، بچۆ لە پشتی عەرەبەکانەوە بسووڕێوە و وەرە بە دزی ئەسپەکانەوە خۆت بکوتەرە ناو دروشکەکەوە؛ ئەگینا ئەسپەکان چاویان پێت بکەوێ بە دوو زەلامت تێ‌ئەگەن نایەڵن!».

**٢٠٨.** حاجی دەروێش هەبوو بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵێك لە خێڵێکی کەماڵەیی بووم. خێڵەکە گاوانیان نەبوو، خەڵکەکە خۆیان بە نۆبە هەر ڕۆژی یەکێکیان ئەچوونە لای گالەکە. وتی: کابرایەکی پێکوڕەی پیر هەبوو، ڕۆژێك نۆبە کەوتە نۆرەی ئەوەوە. گاگەلی دایە پێش و چوو بۆ لەوەڕ. ئەگەنە شوێنی لەوەڕ، گاگەل خەریکی لەوەڕ ئەبێ و ئەمیش بۆی ڕائەکشێ خەوی لێ ناکەوێ، هەتاوەکەی تۆزێ گەرم ئەبێ، کابراکەی ئەکەوێتە نزگەرە. مرخ لە جاشوولەیەك خۆش ئەکا بۆی ناگیرێ. ماکەری دایکی جاشکەکە ئەداتە بەر. ئێوارە گاگەل دێنێتەوە، ماکەرەکە بە خۆی و جاشکەکەیەوە ڕوو ئەکاتەوە ماڵی خاوەنی. کە ئەگەنە نزیکی ماڵ، جاشەکە بە دەوری دایکەکەیا هەڵئەپەڕی و جووتەی ئەوەشاند و غارغارانی ئەکرد. وتی: گوێم لێ بوو کابرا ڕووی کردە ماڵی خاوەن کەر و وتی: جاشکەکەتان ئەزانێ ئیمڕۆ زەماوەنی دایکی بوو، بۆیە وا کەوتگە خۆشی خۆشی و جامبازە.

٢٠٩. لە مزگەوتێك لە بەغدا وەیا بڵێینی لە مزگەوتەکەی لای خۆم، ئەوا نوێـژی نیوەڕۆیـە خەریکـی دەسـتنوێژ شـتن بـووم. دوو زەلامی کوردی ئەو بناری کفرییە هاتن بۆ نوێژ. یەکێکیان ڕیشی سپی و ئەوی‌کەیان لە دەوری سی ساڵانێکا ئەبوو. ئەمی سی ساڵەکە زۆر تەنگەتاو بوو، مەسینەیەکی هەڵگرت و چووە سەر ئاودەستەکە و ڕیش سپییەکە لە دەرەوە وەستابوو. کابرا کە هاتە دەرەوە ڕیش سپییەکە پێی وت: بۆچی مەسینەکەت نەهێنایە دەرەوە؟ ئەویش وتی: ئەوەندەی ئاو تیایە ئەگەر هەر میز بکەی بەستە. مامەی ڕیش سپی هەر وا لەسەر خۆی وتی: «ئاخر ئەترسم گوویشم وە ڕیشەوە بوێ». ئەویش وتی: «کوڕە قیروسیا ئەگەر وە ڕیشیشتەوە بوێ هەر بەستە!».

٢١٠. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: شێخ محەمەدێك هەبوو لە تەکیەی لای ئێمە (تەکیەی قەرەداغ) پێیان ئەوت: شێخ «محەمـەدە جنۆکـە». ئـەم شێخ محەمەدە نوشتە و شتی ئەکرد. پارچە زەوییەکی هەبوو لەگەڵ پیرێژنێکا هاوسنوور بوون. بە درێژایی زەوییەکە بەردیان دانابوو بە بەینا بۆ ئەوە زەوی هەردوو لایان دیار بێ.

ئەمجا ئەم شێخ محەمەدە جنۆکەیە هەموو ڕۆژێ ئەچووە سەر بەردی سنوورەکە، قورعانێکی هەبوو لەگەڵ خۆی ئەیبرد ئەیگرت بە بەر چاویەوە و بەدەم گەڕانەوە قورعانی ئەخوێند، لە ژێریشەوە بە پێ پێی ئەدا لە بەردی سنوورەکە و ئەیخشانە ناو زەوی پیرێژنەکەوە. بەم جۆرە گەلێ لە زەوی ئەو پیرێژنەی خستبووە سەر زەوییەکەی خۆی؛ بەڵام ئەم شێخ محەمەدە لە ئەنجاما بە نەخۆشی «سیل» مرد و دنیا و زەوییەکەی بەجێ هێشت!.

٢١١. کابرایەکی «مامێزەك»ـی جارێك لە مانگی موحەڕەمدا ئەچێتە کرماشان. ئەم مامێزەکیانە «سوننی» مەزەبن. لە کرماشان بە زۆر ڕاپێچی ئەدەن و ئەیخەنە ناو دەستەی سینەزەنەکانەوە. ئەویش چار ناچار دەست ئەکا بە سنگ کوتان و بەلایەوە وا ئەبێ ئەم سنگ کوتانە و دوژمنایەتییە بۆ عومەرە. جا بەدەم سنگ کوتانەکەیەوە ئەمانەی خوارەوەی ئەوت:

| | |
|---|---|
| یـە کار زوورە یـا ئومـەر | چەمانـم کـوورە یـا ئومەر |
| ئەی دەستەی من لەسەر سینە | تۆ مەوشـە ئـەی کارە کینە |
| جەرگم سـووتایە یـا ئومەر | ئـەڕات وە داخـە یـا ئومەر |
| هەلەق مەلەق ئەوشم وە تۆ | وە زوور ئەوشن بۆشینم وە تۆ |
| یانـە ڕای من گـوو خواردنە | سەیەل وە ئاسـمان خستنە |
| یـە کار زوورە یـا ئومـەر | چەمانـم کـوورە یـا ئومەر |

٢١٢. لەو خۆشناوەتییە پیاوێك هەبوو «هەمزۆکە»یان پێ ئەوت. ئەم هەمزۆکەیە چووبوو بۆ کاروان بۆ ئەو دەشتی دزەییە بۆ ترێ فرۆشتن. ترێکەی نەئەفرۆشرا، لە گەڕانەوە زۆر دواکەوتبوو. ڕۆژێك ژنەکەی بە کاروانچی‌ترا خەبەری بۆ ئەنێرێ کە بگەڕێتەوە ترێ ئەفرۆشێ نافرۆشێ قیروسیا، ماڵ بێ‌خاوەنە با لەمە زیاتر دوا نەکەوێ.

هەمزۆکە ئاگری جگەر و ئاگری گزەر هەڵیئەگرێ، ترێ بەجێ دێڵێ و سواری نێرەکەرەکەی ئەبێ و ئەگەڕێتەوە و بە تاو ئەڕوا. لە ڕێگادا هەر جارە بە هەردوو پێی ئەماڵێ بە ژێر سکی نێرەکەرا بۆ ئەوە خێرا بڕوا. جارجار پێی ئەکەوێ لە شتێکی ڕەپی ڕەقی درێژ! بە لایەوە سەیر ئەبێ، لای وا ئەبێ سەری قەیاسەکەیە شۆڕ بووەتەوە، دەست ئەبا هەڵیگرێتەوە

و بیبەستێتەوە، کەچی کێری ڕەپی نێرەکەری دێ بەدەستەوە. ئەمەش ئەوا لە نزیکی ئاوایی و ماڵەوە ڕوو ئەدا.

هەمزۆکە تووڕە ئەبێ و دائەبەزێ و دێتە وێزەی کەری بەستەزمان، ئەڵێ: «دایکت دەگێم ما بە شوێنی تۆیانا ناردیە یا من! وا بەم جۆرە ئێرەقت کردییە؟ چما هەمزۆکەیت و لۆ لای سەمەنێ دەچییەوە. من هەمزۆکەم تۆ چ ڕایەت دەکەوێ دەستی لۆ سەمەنی درێژ کەی؟ چما داکوو ناگێم ئەوی من گۆتم تۆ بیرێت». (سەمەنی، ژنی هەمزۆکە بوو).

**٢١٣.** لەو خێڵە کوڕێك هەبوو «گۆڵە» و کچێکیش هەبوو «سۆسە»یان ناو بوو. گۆڵە و سۆسە هەردووکیان لەو ڕووباری «کارێز»ـی لای سەقزە لای ڕان ئەبن. گۆڵە لەمبەر ئاوەکەوە و سۆسە لەوبەرەوە شەوێ مەڕ تێری خواردووە و مۆڵی بەستووە، دنیاش مانگەشەوە و فێنکە. سۆسەش بەلای ڕانەکەوە لەسەر گازی پشت ڕائەکشێ و خەوی لێ ئەکەوێ. خەویشی ئەوەندە گران ئەبێ هەر شتێکی لێ بکەن بەئاگا نایەت.

گۆڵە لەوبەرەوە کە سەیر ئەکا وا سۆسە بازاڕی خستۆتە ئەو دەشتە و مانگەشەو لێی داوە، ئەوەندەیتر بەیاتە بۆتەوە! ئاگری دەروون هەڵیئەگرێ، ئەکاتە ئەمبەر ئاوەکەوە خۆی ئەدا بە سۆسەدا. بەڵام سۆسە هیچ خەبەری نابێتەوە. ئەو ئیشی خۆی تەواو ئەکا و ئەگەڕێتەوە بۆ جێگای خۆی. بەیانی کە سۆسە هەڵئەستێ سەیر ئەکا ناو گەڵی شڵەقاوە، زۆر سەری سڕ ئەمێنێ. بانگ ئەکا هۆ هۆ گۆڵەی شوانی ئەو وەری ئاوەکە! ئیمشەو تۆ نەتکردگەسە ئەم وەری ئاوەکە؟ گۆڵەش ئەڵێ: نا نا سۆسە. ئەڵێ: ئیمشەو تۆ منت نەگاگە؟ ئەڵێ: نا نا ئەوە تۆ ئێژی چی؟ گۆڵەش بۆیە وا ئەڵێ چونکە بیری تازە ئەبێتەوە.

سۆسە ئەڵێ: ئەی کوچکت لێ نەواریێ ناو گەڵی من بۆچی شڵەقیاگە؟ گۆڵە ئەڵێ: ئەوە ئاونگ لێی داگە. سۆسە ئەڵێ: ئەی چەپکێ لە مووەکە بۆچی چووگە وە ناوا؟ ئەڵێ: ئەوە مێ پەری ماڵی لالەت پێی پیا نیاگە. ئەمجا سۆسە ئەڵێ: ئۆخەی خوا کەس نەیگاگم، مێ پەری ماڵی لالەم پێی پیا نیاگم!.

ئەم ڕاز و نیازەی نێوانی هەردوو لاشیان هەر لەمبەر و لەوبەری ئاوەکە ئەبێ.

**٢١٤.** خورشیدئەفەندی ڕواندزی هەبوو، حاکم بوو لە کەرکووك. ڕۆژێك کابرایەکی زرتەبۆز ئافرەتێك خراپ ئەکا. ئیش ئاشکرا ئەبێ، کەسوکاری ئافرەت شکات ئەکەن. کابرا و ژنەکە دێننە مەحکەمە. خورشیدئەفەندی لە ژنەکە ئەپرسێ: ئەم کابرایە کوو هاتە لات و کوو ڕازی بوویت؟ ژنەش ئەڵێ: قوربان جەنابی خورشیدئەفەندی! هیچ ئاگام لێ نەبوو، نازانم چۆن شتی وا بووە. کابرا وا بەولاوە ڕاوەستاوە، بەلام کابرا کابرا نییە، لەندەهۆرێکە. خورشیدئەفەندی هەڵدەستێ کورسی بەجێ دێڵێ، دارعەساکەی هەڵئەگرێ ئەینێ بەسەر سنگی کابراوە و ڕوو ئەکاتە ژنەکە و ئەڵێ:

هەی قەحبەی ماکەر! ئائەم کسۆك بابە کەر بگێ سەقەتی دەکا! هەنووکە تۆ کوو ئەڵێی ئاگام لێ نەبووە؟! بەم جۆرە مەحکەمەیان ئەکا.

**٢١٥.** مەلا ناسح لە کەرکووك ـ بەڕەحمەت بێ ـ لە نوێژی بەیانیانا زۆر درێژەی ئەدا بە نوێژەکە. بەیانییەك خۆی پێشنوێژی ئەکا و سوورەی «البقرە» لە نوێژەکەدا ئەخوێنێ. کابرایەکی «کونەکۆتر»ی بە خەڵووز فرۆشتن چووبوو بۆ کەرکووك. ئەو بەیانییە لە پشت سەری

مەلا ناسحەوە نوێژ ئەکا، ئەیەوێ زوو لێ بێتەوە و بڕواتەوە. مەلا ناسحیش هەر لە نوێژ نابێتەوە. کابرا تەنگەتاو ئەبێ، نوێژەکە ئەبڕێ و بە دەنگی بەرز بانگ ئەکا ئەڵێ: «مەلا، گوو بە ڕیشی باوك ئەو کەسە لە پشت سەر تۆوە نوێژ ئەکا! وە خوا بیبڕێ ئەم نوێژەش کە تۆ ئەیکەی!».
ئەمە ئەڵێ و ئەکا بە پێڵاوەکانیا لێ ئەدا ئەڕوا.

**٢١٦.** جەمیل ئاغای حەوێزی لە کۆیە پیاوێکی بە نان و خوان و دیواخانگێڕ بوو. هێشتا ئەم پاکەت و ماکەتە دانەهاتبوو، باو هەر باوی جگەرەی قامیش بوو. جەمیل ئاغاش دوو جۆرە جگەرەی لە باخەڵا بوو، جۆرێکی «توتنی بێشەمە» بوو، ئەوە هەر بۆ خۆی بوو؛ جۆرەکەی تری تووتنی کۆیە بوو. کە میوانێك ئەهات، دەستی ئەبرد لە تووتنەکەی کۆیە جگەرەیەکی ئەدایە و لە بێشەمەکەش جگەرەیەکی بۆ خۆی دەرئەهێنا. خەڵکیش وایان ئەزانی هەردوو تووتنەکەی هەر یەکە، بەڵام لە ئاخرا هەستیان پێ کردبوو کە ئەمە وا نییە.

ڕۆژێك لە دیوەخان دائەنیشن و لەسەر عادەتی جاران جگەرە دەردێنێ بۆ میوان و جگەرەیەکیش لە بێشەمەکە بۆ خۆی دەردێنێ. قوتو جگەرەکەی خۆی کەوتبووە سەر گۆی مەمکی. لەو کاتەدا کە ئەینێتەوە بەیەکا بەر مەمکی ئەکەوێ، زۆر عەزیەتی ئەدا. لە تاوانا ناوچاو دێنێتەوە یەك. هەمزەی خۆمان لەوێ ئەبێ، هەستی پێ ئەکا کە چ باسە ئەڵێ: «ئاغا جگەرەیەکمان بدەرێ و خۆت بەو دەردە مەبە، جگەرەیەك ئەوەی ناوێ کە پیاو خەریك ئەو فرتوفێڵە بێت بۆی و مەمکی خۆی بۆی بریندار بکا!».

جەمیل ئاغاش ئەڵێ: هەمزە مردووت مرێ! جارێ وەختی ئەو قسانە نییە. هەمزەش ئەڵێ: ئاخر ناڵێم.

**٢١٧.** مەلا پیرۆت لە دێی «بێتواتە» بوو، شەوێ لەگەڵ مەلاژنا ئەکەونە گەمەوگاڵتە. کە خۆت ئەزانی داخوازی ژنیش هەر دوایی نایە، شتێکی بۆ جێبەجێ ئەکەی، دوو شتی‌تری دێنێتە سەر. بەتایبەتی جا لەو وەختەدا مەلاژن هەر داوای کراس و کەوا و چارۆکەی ئەکرد. مەلا پیرۆت هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ: دەستی برد مێزەرەکەی لە تەنیشت مەلاژنەوە دانا وتی: مەلاژن بیکە بە خاتری ئەم مێزەرەیە وازم لێ بێنە و لەمە زیاتر سەرم لێ تێك مەدە!.

**٢١٨.** «خورشە» تازە مێردی کردبوو بە حەمەوەیس. یەکتریشیان زۆر خۆش ئەویست. خورشە هێشتا جلی بووکێنی لەبەر دانەکەندبوو ـ مردن لە ڕێگای هەموو کەسێکایە ـ حەمەوەیس مرد. خورشە هەموو ئێوارانێك ئەچووە سەر گۆڕەکەی و تێروپڕ بۆی ئەگریا.

ئێوارەیەکیان چوو بۆ سەر زیارەتان لە جۆشی گریانا بوو، کوڕێکی گەنجیش هات لەوبەری قەبرەکەوە دانیشت و لەو بە کوڵتر دەستی کرد بە گریان. پاش لێبوونەوە خورشە بە کوڕەکەی وت: خوا سواوت بنووسێ براکەم. کوڕەش چاوی سڕیەوە وتی: توخوا خوشکم ئەوە چیت بوو؟ خورشە وتی: وەڵڵا براکەم، مێردم بوو. وتی: زۆرت خۆش دەویست؟ وتی: بێ یەك نەمان‌ئەکرا، وا ئێستا خاك لێکی جیا کردینەوە. ئیتر خورشە نەیپرسی لە کوڕەکە کە تۆ چی ئەم بوویت وا بەو جۆرە بە کوڵ بۆی ئەگریای. ئەمجا کوڕە وتی: دەسا خوشکم بیکە بە خاتری ئەو خۆشەویستە جوانەمەرگەت ئەگەر لەو شوێنەدا یەکێکم نەدەیتێ؟ خورشەم خورشەبوو هەر گوێی لەمە بوو هەستا لووس و باریك بۆی پان بووەوە و وتی: وا سوێندم ئەدەی بە گۆڕی حەمەوەیسی جوانەمەرگ، ناتوانم دڵی بشکێنم! وەرە پێشەوە. ئیتر کار لە کار ترازا.

٢١٩. مەلا عەلی قووچەبڵباسی کتێبێك لە بەردەستیا بوو وتم: ئەوە چییە؟ وتی: «قَصَصُ الأنبیا»یە. وتم: کتێبێکی باشە بۆ وەعز کردن. وتی: بەڵێ، کتێبی چاکە بەڵام خەڵکەکە زۆر سەگ بوون بڕوای پێ ناکەن!.

٢٢٠. حاجی غەفووری «مەڵالەر» ماینە گەڕێکی هەبوو زۆری ئەڕەتان. هەموو جار لەناو خەڵکیشا بۆ ئەوە خۆی پیشان دا کە ماینی هەیە زۆری باس ئەکرد. ڕۆژێك ئەکەوێتە شوێن کەروێشکێك، هەرچەندە ئەکا بۆی ناگیرێت، لە پاشا لێیان پرسی: حاجی غەفوور ئەوە بۆچ کەروێشکەکەت بۆ نەگیرا؟ ئەویش بۆ ئەوە ماینەکە نەشکێنێ وتی: برا، ئەوی بەسەر ئەو ماینەی منا هاتبوو، بەسەر حەسەن و حوسێندا نەهاتووە!.

٢٢١. حاجی برایماغای عەنبار جارێك «حاجیلەقلەق»ـێکی لەسەر بانەکەی خۆیان بەرچاو ئەکەوێ، تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: ئەو قەحبەبابەی ڕانك لە پێیە کێیە چووەتە ئەو سەربانە؟

تومەس ئەمە حاجیلەقلەقە بە زەلام تێگەیشتووە.

٢٢٢. کابرایەکی خەڵکی ئەو «گرێزە» و «موانە» ئەچێتە خزمەتی «کاکەحمەدی شێخ» تۆبە بکا. دنیاش چلەی زستان ئەبێ، هەر بەرۆکی کاکەحمەد ئەگرێ و وازی لێ نایەنێ؛ لە ئەنجاما سەر ئێوارەیەك کاکەحمەد پێی ئەڵێ: بچۆرە ئەو حەوزەوە. کابراش ئەچێتە حەوزەکەوە و تا بەیانی تیایا ئەمێنێتەوە. بەیانی کاکەحمەد بەوێدا تێئەپەڕێ، کابرا لەناو حەوزەکەوە بانگی ئەکا ئەڵێ: قوربان خووسیاگم؟ شێخیش ئەفەرموێ: خووسیاگی، وەرە دەرەوە.

پاشان لە کابرا ئەپرسن: مردووت مریّ، چۆن شەویّ لەو حەوزەدا سەرما نەیکوشتی؟ ئەویش ئەڵیّ: برا، لە دوورەوە چاوم لە ئاگرەکەی گڵەزەردە بوو، تەسکینیم بۆ ئەهات!.

**٢٢٣.** کاك مەسعوود گێڕایەوە وتی: لەو مەنگوڕایەتییە ئاغایەك دوو خزمەتکاری هەبوو، یەکێکیان نەخۆش کەوت و لە جێگەدا بوو. ئاغا، خزمەتکارەکەی تری لەگەڵ خۆی برد و چوو بۆ سەردانی. دەستی کرد بە دڵنەوایی و دڵدانەوە. خزمەتکارەکەش وتی: قوربان ئەترسم لەم نەخۆشییە ڕاست نەبمەوە و بمرم؛ گەردنم ئازاد کە. ئاغاش وتی: تۆ کوڕی چاك بوویت و هیچ خراپەیەکت بەرانبەر بە من نەبووە تا گەردنت ئازاد کەم. ئیشەڵڵا ناشمری و هەڵئەستیتەوە. خزمەتکارەکەش وتی: قوربان ئەترسم هەڵنەستمەوە هەر ئەبیّ گەردنم ئازاد کەی. ئاغاش وتی: ئاخر هیچ خراپەیەکت نەبووە تا گەردنت ئازاد کەم. خزمەتکارە وتی: ڕاست ئەفەرمووی، هیچ خراپەیەکم نەبووە، بەڵام دوو جار ئاغا ژنم گاوە! ئەبیّ گەردنم ئازاد کەی.

کە ئەمەی وت. ئاغا زۆر تووڕەبوو، هەستا بەجێی هێشت و هاتە دەرەوە، هەر قسەی ئەکرد و جنێوی ئەدا. خزمەتکارەکەی تر کە [لە] پشت سەریەوە بوو وتی:

خۆت عاجز مەکە، ئەم کابرایە کەرە وا قسە ئەکا. من تا ئێستە پەنجا جاریش ئاغاژنم گاوە و هیچ قسەشم نەکردووە!.

**٢٢٤.** حەمە سابڵاخی بۆی گێڕامەوە وتی: «حاجی میرزا ڕەحمەت»ی سابڵاخی ئەو سەردەمە کە ترۆمبێل و شتە نەبوو، قافڵەی ئەو لە هەموو وڵاتی سابڵاخ و موکریانا مەنشوور بوو. جارێك قافڵە ئەچیّ

بۆ تەورێز بارخانە بار ئەکا و ئەگەڕێتەوە و ئەگەنە سەر چۆمەکەی سابڵاخ. لەم‌لاوە هەموو خەڵکی سابڵاخ و حاجی میرزا ڕەحمەت خۆیشی دەرئەچن بۆ سەیری قافڵە. پێشەنگی قافڵەکە لەوبەری ئاوەوە «مان» ئەکا و ناپەڕێتەوە؛ کە پێشەنگیش نەجووڵێ هەموو کاروان ئەوەستێ. هەرچەندە قەتارچی «هەیدێ»ی لێ ئەکا کەڵکی نابێ.

حاجی میرزا ڕەحمەت لەم‌بەرەوە بانگ ئەکا: کوڕە، ئەوەی کە جاران پێت وتووە ئەوەی پێ بڵێ. قەتارچیش ئەڵێ: قوربان هیچم پێ نەوتووە، هەر هەیدێم لێ کردووە. ئەمیش پێی ئەڵێتەوە: کوڕە، چیت پێ وتووە، ئەوەی پێ بڵێرەوە؛ ئەگەینە ئەبێ ئەو عالەمە هەر چاوەڕێ بکەن. قەتارچی کە ئەزانێ هیچ کەڵك ناگرێ، لێ ئەوەستێتەوە لە پێشەنگ، تێی ئەسرەوێنێ و ئەڵێ: دە بڕۆ لە قوزی دایکی خێوت بەرم.

پێشەنگ ئەپەڕێتەوە و هەموو عالەم بە میرزا ڕەحمەتەوە دەست ئەکەن بە پێکەنین.

**٢٢٥.** مەحموودی عەلی مراد گێڕایەوە وتی: لەو سەرە کابرایەك هەبوو توولەیەکی هەبوو. توولە تۆپی و کابرا زۆر بە پەرۆش بوو بۆی؛ هەموو جار کە باسی ئەکرا ئەیوت: ڕەحمەتییەکە. مەلاکانی مەنگوڕ سەریان کردە سەری و پێیان وت: کابرا، ئەمە حەرامە، تۆ چۆن بۆ توولەسەگێکی تۆپیو وا ئەڵێیت؟ کابرا وتی: مەلاینە! ڕەحمەتی گەلێ خەسڵەتی چاکەی هەبوو. خێر و خێراتێکی زۆری هەبوو، ماڵی میراتی هەبوو، تەنانەت لە کاتی سەرەمەرگیشدا وەسیەتی بۆ من کرد کە سەد تمەنیشی بۆ بکەم بە ئیسقات! مەلاکە کە ئەو، ئەو قسەیە بۆ ئەکرد وتی: چۆن؟! مەرحووم ئەو قسەشیە فەرمووە؟.

٢٢٦. مەلایەك لە «دەشتەتاڵ» هەبوو، هەر ئیشێك ڕووی ئەدا ئەو ئەیوت: خوا خراپتر نەدا. ڕۆژێك هاتن بۆلای مەلا، وتیان: پیاوێکیان بەسەر فلانە ژنەوە گرتووە. وتی: خوا خراپتر نەدا. وتیان: کوڕە خراپتری چی؟ لەمە خراپتریش؟ وتی: کوڕە ئەوە ئێوە ئەڵێن چی؟ ئەگەر نیو سەعات لەمەوپێشتر بوایە پیاوەکە من ئەبووم!.

٢٢٧. شێخ سەعیدی حاجی شێخ عەلی گێڕایەوە: عەبلانی عەلاف هەبوو لە سولەیمانی، بێوەژنێکی مارە کردبوو. لە پاش بەینێك تەڵاقی دا. کابرایەکی‌تری عەلاف مارەی کرد. لە پاش چەند مانگێك ئەویش تەڵاقی دا. عەبلان مارەی کردەوە؛ دیسان تەڵاقی دایەوە، ئەوتر مارەی کردەوە. لەسەر ئەم ئاو و دانە شەش حەو جار ئەمیان تەڵاقی ئەدا، گورج ئەوی‌تریان مارەی ئەکردەوە. بێوەژنی هەژار ئەتوت تۆپی جلێتێنە ئەم هەڵیئەدا بۆلای ئەو، ئەوی‌تریشیان تێی هەڵئەدایەوە بۆلای ئەم. لە ئاخرا جارێك لە بێوەژنیان پرسی: باجی عاسم ئەم دوو مێردەت کامیان باشتر بوون بۆت؟ وتی:

بەخوا براکەم خێری خێر بێ لە هیچیانم نەدی، تەنها ئەوە نەبێ ئەوان بەسەر منەوە کاوێژیان ئەکرد.

٢٢٨. حەمەی عەول هەبوو دوو ژنی هەبوو، هەریەکەی دەنکە مووروویەکی دابوونە دەست، بێ ئەوەی هیچیان بەوی‌تریان بزانن. کە پێکەوە دائەنیشتن، لێیان ئەپرسی: کامیانت خۆش ئەوێ؟ ئەیوت: «ئەوەیانم خۆش ئەوێ کە دەنکە موورووەکەم داوەتێ!».

٢٢٩. کابرایەك لە گوندی «شێنێ» هەبوو ناوی «ڕەشە» بوو. ڕۆژێك ئێسترێك ئەداتە پێش خۆیەوە ئەچێت بۆ دارقیسپان بۆ قۆریە

گیا و گا و شتی وا. بارە قیسپ ئەبڕێ و پاشان هەرچەندە ئەکا نازانێ بارەکە لە ئێسترەکە بنێ، مەحتەل ئەبێ؛ پاشان دێ بە بیریا کە بارەکە لە کۆڵی خۆی بنێ و خۆیشی سواری ئێسترەکە ببێ. بەم جۆرە بار ڕێك ئەخا و بەرەو ماڵ بەڕێ ئەکەوێ.

لە ڕێگادا دوو داری گەورە لەوبەرەوبەری ڕێگاکەدا ئەبێت، ئەمیش باری توند لە خۆی شەتەك داوە. دار قیسپەکانی کۆڵی لە دوو دارە گەورەکە ئەگیرێن. ئێستر بە گوڕ ئەڕوا، کابرا بە هەڵواسراوی لەوێدا ئەمێنێتەوە. ئێستر بە خاڵییەتی ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە.

خزمان کە تەماشای ئەمە ئەکەن ئەڵێن: شتێك لە ڕەشە قەوماوە. دێن بە هاواریەوە. کە ئەگەنە ئەو شوێنە سەیر ئەکەن ڕەشە بەو هەواوە ڕەپ ڕاوەستاوە. ئەڵێن: کوڕە ڕەشە ئەمە چییە؟ دایئەگرن و ئەمجا ئەڵێ:

ئەو ئێسترۆکەم بۆ بێنن هەر ئەبێ ئێستە ورگی بدڕم. من وتم: با بارەکە لەو نەنێم بۆ ئەوە عەزیەتی نەگاتێ، هێنام لە خۆمم نا و سواری بووم؛ کەچی گەیشتینە ئەم شوێنە هەرچەندە کشووم کرد، هیچ گوێی نەدامێ. ئەو بۆ خۆی چووەوە و منی دا بەدەست ئەو دارانەوە؛ ئاوا تۆڵەی پیاوەتیم ئەداتەوە؟!.

**٢٣٠.** مەلا ئەوڕەحمانی تایشەیی گێڕایەوە وتی: لەم ئاخرەدا لەو دەشتی گەرمیانە لە خێڵێکا وەعزم ئەدا. لە وەعزەکەدا وتم: کتێب ئەفەرموێ:

کاتێ کە خواوەنتەعالا کردیە سەر ئیزراییل کە گیانی خەڵکی بکێشێ و ئەو ئیشەی بەو سپارد، حەزرەتی ئیزراییل وتی: بینایی چاوان! ئەم ئیشە بۆ من زۆر گرانە و لە ئاهـ و نزوولەی ئەو عالەمە چۆن دەرئەچم، کە ناوم بەسەر زمانی هەموو کەسێکەوە بێت؟ ئەم ئەرکە بە من هەڵناگیرێ.

خواوەنتەعالاش فەرمووی: یا ئیزراییل تۆ بچۆ ئیشی خۆت بکە، کەس ناوی تۆ ناهێنێ. یەکێك ئەڵێ: لەسەر بان کەوتە خوارەوە مرد؛ یەکێك ئەڵێ: لە وڵاخ گلا و مرد. هەریەکە شتێکی بۆ ئەڵێن، کەس بەلای تۆدا ناچێت و ناوت ناهێنن. وتی: حاجی محەمەدێکی شاتری هەبوو لە وەعزەکەدا دانیشتبوو هەڵیدایە وتی:

ئەرێ مەلا، خوا وە قوروانی وم، ئەو وەختە لە بیری نەبوو باسی ترمبێل و تەیارەیش بکا؟! چاوت لێیە حاجی مەلا شەریفی سەعاتچی ئەو پیاوە نوورانییە و مەلا عەلی لەیلان ئەو پیاوە دەم وە قورحانە چۆن وە ترمبێل و تەیارە ڕۆیشتن. ئەویان بە ترمبێل کەوت و ئەمیان لە تەیارە کەوتە خوارەوە و بەو جۆرە سەریان تیا چووا. دەسا مەلا هەرچی ئێژیت بۆ خۆت ئێژیت، گشتی هەر ئەو ئیزراییلە بێفەڕەس!.

٢٣١. قانعی شاعیر گێڕایەوە وتی: ئەوا دەستەیەکین چووین بۆ ماڵی «شێخ عەول»ـی «سەرکان» و بووین بە میوانی ئەوان و دامان نابوو کە ئێستە مەڕێکمان بۆ سەر ئەبڕێ و مەنجەڵێ پڵاو و گۆشتمان بۆ ئەخەنە سەر. کە چووین و دانیشتین شێخ عەول خۆی بەخێراتنێکی زۆر گەرمی کردین و لە پاشا دەستی کرد بە گێڕانەوەی ڕاوی ئەو ڕۆژەیان. کردی بە گاڵە کە چۆن کەروێشکیان هەستاندووە و کەوتوونەتە شوێنی. وتی: لەولاوە تانجیمان تێی بەر دا و کردمان بە قریوە لێی، لەم لاوە چەند زەلامێك بەریان لە کەروێشك بڕیەوە و دەستەی بن ڕاو کردیان بە هەرا. ئەمجا لە ناکاو و لەسەرخۆی بەری کرد بەولاوە و وتی: ئامینە ئا ترشاوێك لێ نێ بۆ ئەمانە.

دیسان تێی هەڵچوو و بە گەف و گوڕەوە وتی: بەخوا تانجیم تانجی

بوو لە پەڵەکەدا خۆی گەیاند بە کەروێشك و گرتی. خێرا حەمە چوو لە دەمی وەرگرت و سەری بڕی. بەڕاستی ڕاوی ئیمڕۆمان زۆر خۆش بوو.

ئەمجا قانع وتی: ئێمەش دەممان بوو بە تەڵەی تەقیوەوە بە تەمای چی بووین و کەچی تووشی خواردنی چی هاتین!.

**٢٣٢.** لە سەردەمی شەڕی شێخ مەحموودی مەلیکدا لە تەلان و جاسەنە تەیارە بۆمبۆردمانی ئەکرد، دەروێش مارفێکی ڕوغزایی هەبوو، لە ترسی تەیارە خۆی دابووە پاڵ کەندەلانێك. لەوێدا هەر ئەوەی ئەوت: گووت لێ وارێ تەرەشقەکە، خوای لێی وڕیگمەوە تا دەمێکم وە خوا بگا بێژم بۆچ وا ئەکەیت؟.

**٢٣٣.** بابەکراغای پشدەری گێڕایەوە وتی: پیاوێك ژنێکی هێنا لەو وڵاتی سوێسنایەتییە. ژنە مەرجەکەی ئەوە بوو کە کابرا شەوێ دە بکا. کابرا تا ماوەیەك وابوو، پاشان هاتە سەر شەوێ پێنج و پاشان بوو بە یەك. دیارە ژنە بەمە داناسکێ؛ چووە لای مەلا شکاتی کرد، نەشی ئەویست بە تەواوی و بە ئاشکرا بیڵێت، هەر ئەوەندەی وت وتی:

تا بوو وا بوو، لار بوو وا بوو چ بکەم، ئێستە لەم کوڵە. (بە پەنجەشی لەگەڵ قسەکانا ئیشارەی ئەکرد)

ئەمجا مەلا لە پیاوەکەی پرسی: تۆ ئەڵێی چی؟ ئەویش وتی:

تا بوو وا بوو، لار بوو وا بوو چ بکەم ئێستە لەم دۆڵە.

ئەمیش دیسان بە پەنجە و بە باڵ ئیشارەی ئەکرد، کارەساتەکەش بەم جۆرە بوو:

ژنە لەگەڵ وتنی: «تا بوو وا بوو» هەر دە پەنجەکەی ڕاست کردۆتەوە و ڕووی کردۆتە مەلا، یانی دە جار. کە وتی: «لار بوو وا بوو»، پێنج پەنجەی

لا برد و پێنجی هێشتەوە و تۆزێ لاریشی کردەوە، یانی دەیەکە هاتە سەر پێنج و پێنجەکەش ئەو هێزەی نییە؛ واتە دەعباکەی شل بووە و ئەو هێزەی نەماوە! کە وتی: «چ بکەم ئێستە لەم کۆڵە» هەر یەك پەنجەی ڕاست کردەوە، ئەویش سەری پەنجەی چەمانەوە، وەکوو کۆڵی لێ هات؛ یانی ئێستە هەر هاتۆتە سەر یەکێ، یەکەکەش وانێکەکەی بە تەواوی لووتی داژەندووە و کۆڵ و کول بووە. من چی بکەم لەوە؟ بە کەڵکی من نایە.

ئەمجا کابراش وتی: «تا بوو وا بوو» بە دەستی چەپی پەنجە گەورە و دۆشاومژەی گەیاندەوە یەك و وەکوو هەڵقەی لێ کرد، یانی لە کاتی خۆیا بلامانێکەی تەسك بوو! کە وتی: «لار بوو وا بوو» هەردوو پەنجە گەورەی هەردوو دەستی نووسان بەیەکەوە لەگەڵ هەردوو دۆشاومژەی، هەردوو دەستی ئەوانیشی پێکەوە نووسان و وەکوو هەورەبانی لێ هات؛ واتە: فلّق بووە! کە وتی: «چ بکەم ئێستە لەم دۆڵە؟». پەنجەی دەستی چەپی خستە سەر کەلەکەی خۆی و بە دەستی ڕاستیشی هاتوچۆی پیا ئەکرد، یانی بلامانێەکەی ئێستە بووە بە شیو و دۆڵ، هیچ بە خۆی نازانێ، من چی بکەم لەو دۆڵ و دۆڵیانە!.

**٢٣٤.** لەو بەر کێوە کابرایەك هێزەڕۆنێکی هەبوو، نۆ هۆقە ڕۆنی تێدا بوو. ڕۆژێك چووە سەری، سەیری کرد هیچی تێدا نەماوە. لە ژنەکەی خۆی پرسی: چی لێ هاتووە؟ ژنەش وتی: با حسابت بۆ بکەم. کابرا وتی: ئادەی. ژنە وتی:

ئەمن یــەك و ئەتۆ دوو ئەوە هەشــت و ئەوە نۆ

پیاوە وتی: دڵم بوو بە ئاوێنە!.





عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەڵەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزڵجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ١٩٤١دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ١٩٤٩دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ١٩٧٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ١٩٧٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٩٨٤/١٢/١٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج- پاساژ عزتی- تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲




